ئاندرێ کریسۆن

# پـــاسکـــاڵ

ژیانی- فەلسەفەکەی- هەڵبژاردە لە نووسینەکانی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**سامان عەلی**

سلێمانی / 2002






**سەرپەرشتیاری زنجیرە**
**ئازاد بەرزنجی**

ناوی کتێب: پاسکاڵ
ناوی نووسەر: ئاندرێ کریسۆن
ناوی وەرگێر: سامان عەلی
بابەت: فیکری
مۆنتاژ: سەیران عەبدولرەحمان
هەڵەچن: ناسک عەزیز
تیراژ: 500 دانە
ژمارەی سپاردن : 401 ی 2002

**زنجیرە کتیبی گیرفانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم(21)**
www.sardam.org







## پێڕست





# نەسکی یەکەم

## ژیانی پاسکال

"پاسکالی برام لە نۆزدەی مانگی حوزەیرانی ساڵی 1628 لە کلیرمۆن لەدایك بووە. باوکم ناوی ئیتیان پاسکال بوو سەرۆکی ئەنجومەنی ژمێریاریی بوو. د ایکیشم ناوی ئەنتوانێت بیگۆن بوو. هەرکە کاکم لە خەم ڕەخساو فێری قسەکردن بوو یەکسەر بەهرەی دانایی و ژیریی فیکری لەلای بەدیارکەوت. ئەم زرنگیە لە خێرایی بیرکردنەوەی و لە وەڵامەکانیدا دەرکەوت کە لە کاتی گونجاویخۆیدا دەیدانەوە، بە تایبەت لەو پرسیارانەدا کە بە مەبەستی پرسین دەربارەی چییەتی شتەکان دەیکرد. ئیدی سەرەتا سەرەتایەکی مژدەبەخش بوو لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا شتێك نەبوو کە بە درۆی بخاتەوە. چەندێ تەمەنی بچووایە بەساڵدا هێندەش بیرکردنەوەی بەهێزتر دەبوو، تەنانەت دەکرێ بگوترێت کە





هەمیشە ئاستی هزریی لە تەمەنی ڕاستەقینەی بەرزتر بوو".

جێلبرت ی خوشکە گەورەی پاسکال بەم وشانە "ژیانی پاسکال" دەست پێدەکات. ئەم ژیاننامە biographie یەشی دوابەدوای مەرگی براکەی و بۆ چاپی کتێبی (ئەندێشەکان)ی نووسیوە کە گروپی "پۆرڕۆیال"[1] بەرێبەرێکی بەهاداری دادەنا بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت ئاشنای بلیز پاسکال ببێ.

کاتێك کە بلیز تەمەنی یەکساڵان بوو دووچاری نەخۆشیەکی نادیاروبوو کە نزیکەی دوانزە مانگی خایاند. لەو ماوەیەدا تووشی گرژبوون دەبوو هەستی بە بێزێکی نادیار لە ئاو دەکرد و چاویشی بەرایی نەدەهات کە دایك و باوکی ببینێ. دایکی ڕەنجی زۆری لەگەڵدا کێشاو خزمەتی زۆری کرد، دایك لەم ماوە تەنگانەیەدا کۆرپەیەکی کچی بوو ناونرا جاکلین، لە دوایدا ژیانی بە توندی بەسترا بە ژیانی پاسکالی برایەوەو هۆگری یەکدی بوون، ئەوجا دایکە لە ساڵی 1626دا کە هێشتا تەمەنی کوڕەکەی سێ ساڵانە بوو بە لاوازی و ماندوویی سەری نایەوە. ئەگەرچی بلیز لە سۆزی دایکایەتی بێبەش بوو، بەڵام لە نەرم و نیانی مێینەیی بێبەش نەبوو. لە





نێـوان جووتـە خوشـــکەکەی و لـــە ئـــامێزی گـــەرم کەسـێکی متمانـەپێکراودا پـەروەردە بـوو کـە ویسـتی شـوێنی ئـەو دایکـە بگرێتــەوە کـە هێشـتا زوو بـوو کۆچی دوایی کرد.

ئیتیـــان پاســـکاڵ ی بـــاوکی لـــە دوای مردنـــی هاوســـەرەکەی پــتر لــە جـــاران وابەســـتە بـــوو بـــە منداڵەکانیـــەوەو بڕیـــاری دا کەبـــە خـــۆی بـــەدیار پـەروەردە کردنیانـەوە شـەونخونی بکـات: بـەڵام کـارو فەرمانەکەی وەك بەڕێوەبـەری ئەنجومـەنی یارمـەتی لە مۆنفیران بەشـی شـێریکاتەکانی بـۆ خـۆی دەبـرد، هەربۆیە لە ساڵی 1630دا پۆستەکەی خـۆی فرۆشـت و بـۆ سـاڵی دوایـی چوونـــە پـــاریس نیشـــتەجێ بـــوون. لەبەرئەوەی کە بـارودۆخی دارایـی بـاش بـوو، چۆنـی بویستایە دەیتوانی بەو جۆرە ژیانی خۆی ڕێکبخات.

سەرەتا بنەماڵەکە لە شـەقامی "لایتسـیداندیری" نیشــتەجێ بــوون، پاشــان لــە ســاڵی 1636دا چوونـــە شەقامی (بریزمیش) لە سان مـیری. ئیتیـان ی بـاوك بە تەواوی خۆی بۆ ئەو ئەرکە تـەرخان کـرد کـە لـە ئەســتۆی گرتبــوو، نـــە خاسمـــە شـــەونخونی بـــەدیار





پەروەردەکردنی ڕۆڵەکەیەوە پاش ئەوەی بلیمەتیی گەشەسەندووی بۆ دەرکەوت.

"سەرەکیترین ڕێسای باوکە ئەوە بوو کە کوڕەکەی لە سەروو ئەو بابەتانەوە دابنێ کە پێی دەگوتەوە. هەر بۆیە هەرگیز ئارەزووی ئەوەی نەدەکرد کە بەر لە تەمەنی دوانزە سالان وانەی زمانی لاتینی پێ بلێتەوە، بەو هیوایەی کە بە شێوەیەکی ئاسانتر فێری ببێ"، هەروەها نەیدەویست پێش تەمەنی پانزە یاخود شانزە ساڵی ماتماتیکی پێ بلێتەوە. بە گوێرەی پلانە پەروەردەکاریە نەخشە بۆکێشراوەکەیشی دەستی کردە پێوتنەوەی چەند تێڕوانینێکی سەراپاگیر و هەندێ زانیاری گشتی دەربارەی هەندێ بابەتی گەورەو گران. "بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی بۆ بەیاندەکرد کە زمانەکان چین و، ئەوەی بۆ ڕۆشن دەکردەوە کە ملکەچ بە چەند ڕێسایەکی سینتاکسی دەبن و، ئەم ڕێسایانەش بە دەرایەتی (استثناءات) ی خۆیان هەیە". هاوکات سەرنجیشی بەلای دیاردەکانی سروشت و شتە سەیروسەمەرەکانی نێوی لە نموونەی باروت و شتی تردا ڕادەکێشا.





هەرچی پاسکالیشە دەیویست سۆنگەی هەموو شتێك بزانێت. تەنها بە وەڵامی کورت و خۆدزینەوە ئامێز قایل نەدەبوو. تەنها پرسیارکردن حەزی ئەوی بۆ زانین تێر نەدەکرد بەڵکو خۆی بە دوای چارەسەردا دەگەڕا. ڕاستە کە باوکی بڕیاری دابوو بەر لە تەمەنی پانزە ساڵان باسی ماتماتیکی بۆ نەکات، بەڵام بلیز دەربارەی ئەم بابەتانە پرسیاری لە باوکی دەکردو باوکیشی وەڵامی نەئەدایەوە، ڕۆژێك باوك بینی کوڕەکەی سەرگەرمی سەلماندنی مەسەلەی ژمارە (32)ی کتێبی یەکەمی ئیکلیدس (2)ە کە دەڵێ کۆی گۆشەکانی سێگۆشە یەکسانە بە دوو گۆشەی وەستاو.

چۆن چۆنی بلیز ئەم مەسەلەیەی یەکلایی کردەوە؟ ئەوەتانێ منداڵە زرنگەکە بە باوکی خۆی دەڵێ کە هەر ئێستا ئەوەو ئەوەی دۆزیوەتەوە، ئیدی باوکەش بە مەزنی ئەم بلیمەتیە زووە واقی وڕماو ڕووداوەکەی بۆ "لیبایۆر"ی هاوڕێی خۆی گێڕایەوەو، پاشان بە جووتە بڕیاریاندا کتێبی "بنەماکانی ئیکلیدس"ی بدەنێ تاوەکو لە کاتی دەست بەتاڵیدا بیخوێنێتەوە.





هەروەها ئیتیان کاروباری کچەکانیشی فەرامۆش نەدەکرد، چونکە شتێك هەبوو وای لێدەکرد کە شانازییان پێوە بکات، بە تایبەت بە جاکلینیانەوە کە نەك هەر کیژێکی شۆخ و شەنگ بوو، بەڵکە هاوکات زەین زیندوو بیر ڕەسەنیش بوو، هەروەها زۆر بە سانایش هۆنراوەی دادەنا. لە تەمەنی پانزە ساڵیدا کۆمیدیایەکی لە پێنج بەش نووسی لە هەموو ئەنجومەنەکانی پاریس دا نمایش کرا. لە نێوان بلیز و جاکلین دا هەستی هۆگری بنجی داکوتا، لە کاتێك دا کە مارگرێتی خوشکە گەورە ڕۆڵی دایکی دەبینی. ڕاستە کە "ئیتیان" هەموو کاتی خۆیی بۆ خزمەتی منداڵەکانی تەرخان دەکرد، بەڵام ئارەزووی گۆشەگیر بوون و دوورکەوتنەوە لە کۆمەڵگایشی نەدەکرد. چەندین جار شەقامی بریزمیش ئەو کۆڕو کۆبوونەوانەی بەخۆوە بینی کە بۆ لێکۆڵینەوەو تاوتوێ کردنی ئەو مەسەلانە دەبەستران کە لە خشتەی کاروبارەکاندا هەبوون: بە تایبەت مەسەلە زانستیەکان نەخاسمە ماتماتیك. لە نێوان ئەو کەسانەدا کە ئامادەی ئەم کۆڕو کۆبوونەوانە دەبوون، ڕۆبر ڤال، باوکە مرسین، فێرما، دیزارگ، هەبوون کە هەمووشیان لە ناودارانی ماتماتیك ناس بوون.





سەرەڕای تەمەنی کەمی، بلیز لە نێـو ئـەم ئەڵقـە زانستیانەدا وەرگیرا!

"پیاوی شیاوی شوێنی شیاوی خۆی بوو، زۆرجـار لـەو کەسـانە بـوو کـە شـتی تـازە داهێنـراویـان پـێ بوو". لەبەرئەوەی کە ئارەزووی ئەندازە "الهندسة"ی دەکـرد، هـەر بۆیـە سـاتەکانی دەسـت بـەتاڵی بـۆ ئـەم زانسـتە تـەرخان کـرد. لـە تەمـەنی شـانزە سـاڵیدا کتێبێکـی دانـا کـە نـاوی لێکۆڵینـەوە لـە قوچەکـەکان "بحـث في المخروطـات" بـوو، هـەموو ئـەو ماتماتیکناسـانەی سەرسـام کـرد کـە لـەلای بـاوکی دادەنیشتن.

وەختێـك کـە "ئیتیـان" لـە کلیرمۆن پۆسـتەکەی خۆی فرۆشتەوە پارەوپولەکەی لـە بەڵگەنامـە داهـات "وثـائق دخل" لـەلای کۆشـکی شـارەوانی لـە پـاریس خستە ئیشەوە. بەڵام خراپی ڕەوشی دارایی لە ئاداری 1638دا ناچـاری کـرد کـە چـارەکی بەڵگەنامەداهاتەکـە ئیلغا بکاتەوە. ئیدی ئـەو کاتـە ژمارەیـەك لـە خـاوەن بەڵگەنامەداهاتـەکان چوونـە لای "سـیگێ"ی مـۆر بـە دەستی پادشاو بە توندی ناڕەزایی خۆیانیان دەربڕی، لەم کاتەدا "ریشیلیۆ" (3) سیان لە هاندەرانی توندی





نێو زیندانی باستیل کرد، ئەوانی دیکەشیان لە ترسی گیانی خۆیان، خۆیان شاردەوە، ئیتیان پاسکال یەکێك بوو لەوانە کـە لـەم هەوڵـەیدا زۆر دوورکەوتـەوە. لـە مـانگی ئــەیلولی هــەمان ســاڵیش دا جــاکلین تووشــی نەخۆشــی ئاوڵــە بــوو، بــاوکی بــێترس و دوودڵــی گەڕایەوە بۆ لای هەتا تارمـایی مەترسـیەکەی لەسـەر لاچـوو. هەرکـە جـاکلین چـاك بـووەوە باوکـە پـەنای بـردە بـەر ئۆفـێرنی و منداڵەکانیشـی لــە پــاریس جێهێشت. لە ساڵی دواییدا جاکلین هـەلی بـۆ ڕەخسا کـە لـە بـەردەم کاردینــاڵ ڕیشـیلیۆدا کۆمیدیایــەك نمایش بکات، لە نمایشەکەیدا هێندە سەرکەوتوو بـوو کـە توانـی لێبـووردن بـۆ بـاوکی وەربگـرێ. لــە پــاش ماوەیــەکی کــەمیش ڕیشــیلیۆ لــە "ڕوای" پێشــوازی لێکردو کردیە نوێنەری پادشا لە "ڕوان".

کەواتە تێکڕای ئـەندامانی خێزانەکـە بـە یـاوەری هێـزا "بـیرێ" کـە بـۆ سـاڵی دوایــی بــووە هاوســەری جێلـبرت، ڕوویـانکردە نۆرمــاندی. ئەوکاتــە جێلــبرت تەمەنی بیست و یەك ساڵان بوو. بە هۆی پلەوپایەی بەرزی ئیتیانیشەوە ئەنجومەنەکەی بـووە یـەکێك لـە گرنگـترین ئەنجومەنـەکان و زۆرجـار "کۆرنــای" کــە بایەخی زۆری دەدا بە هەوڵە شـیعرییەکانی جاکلین،





سەردانی دەكرد. هەرچی بلیزە لەسەر خوێندنەكەی بەردەوام بوو هاوكات ئیشی لەگەڵ باوكیشیدا دەكرد. بۆ خۆلادان لە حساباتی دوور و درێژیش بیرۆكەی دروست كردنی ئامێرێكی ژمێرە "آلة حاسبة"ی بە خەیاڵدا هات "كە بەبێ پەڕ هەموو حساباتەكانی پێ بكرێت، نەك هەر ئەوەندە بەڵكە هەروەها بێ ئەوەی ئەو كەسە هیچ شارەزاییەكی لەهەر ڕێسایەكی حسابیدا هەبێ كاری پێ بكرێ و ئەنجامەكانیش بێ هەڵەبن".

لەو ماوەیەوە تەندروستی بلیز خراپ بوو. ئایا ئەم نەخۆشكەوتنە بە هۆی ئەو هەوڵ و ماندووبوونەوە بوو كە لە دروست كردنی ئەم ئامێرەدا كیشرا وەكی خوشكەكەی دەیگوت، یان بە هۆی لاوازییەكی بە میرات بۆ ماوەوە بوو؟ ئیدی مەسەلەكە هەرچۆنێك بێت بلیز لەوەتی هەژدە ساڵییەوە ڕۆژێكی بەبێ ئێش و ئازار نەبردە سەر. بەڵام: "هەركە بۆ ساتێك وچانی دەدا یەكسەر بیری دەچوو بەلای گەڕان بە دوای شتێكی تازەتردا".

لە كانوونی دووەمی 1646دا ئیتیان پاسكال كەوت و ڕانی لەجێ چوو. ئیدی برایان "دیشان" بۆ





خزمەتكردنی هاتنە لای. لە ماوەی چاك بوونـەوەیدا لـە نێـوان هـەردوولادا وتووێژێكـی دوورو درێـژ كـرا. هـەردوو بـرا ئامۆژگارییـان كـرد كـە هـەندێ كتێـب بخوێنێتـەوە بـە تایبـەت كتێبـی "وتـاری ڕاهیـب جانسینیوس[4] دەربارەی چاكسازی ناوخۆیی".

هـەروەها بلـیزیش ئـەم كتێبـەی خوێنـدەوەو بـە تونـدی كەوتـە ژێـر كاریگەرییـەوە. بیروڕاكـانی جانسـینیوس لەگـەڵ مـەزاجیدا كـۆك بـوو لەگـەڵ خواستەكانیشیدا دەهاتەوە: چونكـە یـەكێك بـوو لـەو كەسانەی كە شەیدای ئەرك (واجب) بـوو. كاتێكیش كـە دەركـی بـە ئەسـتەمێتی دابـەش بـوون لـە نێـوان خـوداو جیـهان دا كـرد، بڕیـاریدا كـە هـەموو ژیـانی خۆی بۆ خـودا تـەرخان بكـات و بـۆ ڕەزامـەندی ئـەو كاربكات.

دوای ئەوەی كە بلیز ئەم بڕیارەیدا یەكسەر هانی كەس و كارەكەی خۆیشیدا كەلەگەڵیدا بێنە سەر ئەم ڕێگایـە، ڕێگـای ڕزگـاربوونی ڕاسـتەقینە. جـاكلینی خوشـكی "یەكـەمین كـەس بـوو كـە بڕیـاریدا واز لـە هـەموو ئیمتیازاتـەكانی خـۆی بێنـێ بـۆ ئـەوەی بـە تەواوی خۆی بۆ خودا تەرخان بكـات". ئینجا بـاوكی بەدوایدا هات و هیچ دوودڵییەكی نەنواند لە نوچدان





بۆ ڕێنماییـەکانی کوڕەکـەی، پاشـان سـەرە هاتـە سـەر مـارگرێت بـیرێ و مێردەکـــەی کـــە لـــە پاریســـەوە هـاتبوون، ئـەمانیش بـــە ئاســانی قەناعــەتیان کـرد. ئـەوجا خێزانەکـە خۆیـان خسـتە ژێــر سەرپەرشـتی "گیبێر"ی کەشیشی ئەبرەشـیەی "کـو"ەوە. هـەر لـە ڕێگای ئەویشەوە لـە دواییـدا خێزانەکـە لـە "دێـر"ی پۆڕڕۆیـــال نزیـــك بوونـــەوە. بـــەڵام زیـــادبوونی خواپەرستی خێزانەکەو حەماسەتی پاسکال بۆ هـزرە پەیامبەرییەکان نەبووە ڕێگر لەسەر ڕێگای بەردەوام بوون لەسەر لێکۆڵینەوە زانستیەکانی.

ئەوەبوو لە تشرینی یەکەمی 1646دا هێژا "بیتی" هات تاوەکو چاوی بە "ئیتیان" بکەوێت و، باسی ئەو تاقیکردنەوانـەی کـرد کـە لـە ئیتاڵیـــا ســـەبارەت بـــە بۆشایی (الفراغ) کرابوون.

ئـەو بـاوەڕی کـە لـەو بارەیـــەوە بـــاوبوو دەیـــووت سروشت قینی لە بۆشاییە. پاسکال توانی بە یاریدەی (بیتـی) تاقیکردنەوەکـە دووبـارە بکاتـــەوەو چـــەند تاقیکردنەوەیەکی دیکەشی داهێنا.





بۆ ساڵی دوایی ڕاپۆرتێکی لەژێر ناونیشانی: "تاقیکردنەوەی نوێ سەبارەت بە بۆشایی" دەربارەی کارەکانی خۆی بڵاوکردەوە.

بەڵام نەخۆشی زۆری بۆ هێناو، بەشی خوارەوەی لەشی تووشی ئیفلیجی بوو. ئیدی بە هۆی دوو دارشەقەوە نەبووایە توانای بە ڕێگادا ڕۆشتنی نەبوو. لایەنی زۆر پێدەچێ کە لەوکاتەدا بابەتی: "پاڕانەوە لە خودا بە باش کەڵك وەرگرتن لە نەخۆشکەوتن"ی نووسیبێ. چاودێری و خزمەتی باش لە ئێش و ئازارەکانی کەم کردەوە. لەسەر داوای دکتۆریش لەگەڵ جاکلینی خوشکیدا بۆ چارەسەرچوو بۆ پاریس. کاتەکانی پاسکال دابەش بوو بوو بەسەر چارەسەروەرگرتن و خواپەرستی و لێکۆڵینەوەی زانستی و وتوویژ لەگەڵ هاوڕێیاندا. دوو کەڕەت پێشوازی لە دیکارتیش کرد. لە دوایدا دیکارت دەیووت کە پاسکال وەحی تاقیکردنەوەکانی لە بارەی هاوسەنگی شلەکان لە منەوە وەرگرتووە. هەروەها پاسکال هەندێ گۆڕانکاری باشی بەسەر ئامێری ژمێرەکەدا هێناو، لەسەر لێکۆڵینەوەکانی خۆیشی لە بارەی بۆشاییەوە بەردەوام بوو، چەند تاقیکردنەوەیەکی قەناعەتپێکەریشی ئەنجامدا،





یەکێك لەو تاقیکردنەوانەی لە بورجی (سان جاك) لە پاریس و ئەوی دیکەیشیانی بە یاریدەی (بیریێ)ی زاوای لە (بوی دی دوم) ئەنجامدا. سەبارەت بە کتێبی: "لێکۆڵینەوە لە بۆشایی"، بلاوکرایەوەو تەنها چەند بەشێکی لێدۆزرایەوە. وەختێك کە یەکێك لە مەسیحیەکانیش بە ناوی باوکە "نویل" ڕەخنەی لێگرت، پاسکال بەنووسینێك وەڵامی دایەوە کە بۆنی کتێبی ئایندەی لێدەهات کە ناوی "پەیامە گوندیەکان" بوو.

لەوەتی گەیشتنی بۆ پاریس، پاسکال لەگەڵ جاکلینی خوشکیدا زۆر بە ڕێکوپێکی ئامادەی وتارەکانی هێزا "سانگلان"ی وتاربێژی پۆرڕۆیال دەبوو. جاکلین سەرنجی دا کە ناوبراو بە جۆرێك باس لە ژیانی مەسیحی دەکات "کە لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا تەبایە کە ئەم لە ناخی خۆیدا دروستی کردووە" هەربۆیە ویستی بچێتە پۆرڕۆیال. بڕیاری چوونەکەی لە لایەن پاسکالی برایەوە پشتگیری لێکرا کە ئاگادارکردنی باوکیشی گرتە ئەستۆی خۆی. بەڵام ئیتیان قایل نەبوو بۆ ئەوەی کە ڕێچکەی بیری منداڵەکانیشی بگۆڕی لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ





ئۆفێرنی بۆ لای بنەماڵەی بیرێ. جاکلین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تا دەهات کەمخۆرو گۆشەگیرتر دەبوو، لە کاتێکدا کە پاسکال ی برای بە هاندانی باوکی و پزیشکەکان تا دەهات ئارەزووی بەلای ژیانی ڕابواردن و گەمەکردندا زیاتر دەبوو. بەشداری چەندین کۆڕو کۆبوونەوەی زانستانەی کردو خۆی تێکەڵاو بە ژیانی کۆمەڵگا کرد.

مانەوە لە کلیرمۆن ماوەی حەڤدە مانگی خایاند. لە ئەیلولی 1650 خێزانەکە هەموویان گەڕانەوە بۆ پاریس و لە شەقامی تۆرین نیشتەجێ بوون. لێرە پاسکال لەسەر هەمان ژیانی کۆمەڵایەتی بەردەوام بوو کە لە کلیرمۆن ژیاو، پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەك لە خەڵکی (لێوان لێو لە ڕۆحی کۆمەڵایەتی) لە نموونەی: میر (دۆق) دی ڕوانیز کەبە توندی وابەستە بوو بە پاسکالەوە، دی بارو کە هەر ئەوەندەی کەمێك باری تەندروستی خراپ بووبووایە ئارەزووی ڕووکردنە خودای دەکرد، هەروەها لەگەڵ مەدام دیگۆن ی برازای ڕیشیلیۆدا بەست.

لە 24ی ئەیلولی 1651دا باوکی کۆچی دوایی کرد. پایانی ژیانی باوکی هێندە مەسیحیانە بوو کە کەشیشی ئەبرەشیە لەسەر مینبەر ستایشی کرد. ئەم





ڕووداوه به توندی کاری له پاسکال کـردو وای لێکـرد که دڵنەوایی له ئیماندا ببینێتەوه. لەوه دەترسا کـه ئەگــەر جــاکلینی خوشــکی لــه نزیکــی خۆیـــەوه بهێڵێتەوه، لانی کەم بۆ ماوەیـەك هەسـتی تـەنیایی و میهرەبانی دایبگرێ. بـەڵام هەرکـه سـەره هاتـه سـەر دابەشکردنی پارەو موڵك ئیدی جاکلین بڕیاریدا بـەو گوێرەیه ڕێگا بگرێته بەر که پێشان خۆی بـۆ ئامـاده کردبوو. لـه دوای تەنیاییـەکیش کـه چـەند مـانگێکی خایاند له ساڵی 1652دا جل و بەرگی بوون به ڕاهیبی پۆشـی. لەگـەڵ تـەواوبوونی مـاوەی ئامـادەیدا لــه 5ی حوزەیرانی 1653 دا به تەواوی بووه ڕاهیبـه. وا دیـاره هەندێ مەسەلەی دارایی پەیوەست به میرات هـەندێ شپرزەیی لـه پـەیوەندی بـرا بـه خوشـکیەوه دروست کردبـێ، بـەڵام دواجـار پاسـکال بـه جۆرێـك ڕەفتــاری کــرد کــه تــەمی هــەموو گومــانێکی ڕەوانـــدەوەو جیازیــەکی گونجاوشـــی بــۆ چوونــه پۆڕۆیــال بــۆ خوشکەکەی دابین کرد.

له کاتێکدا که جاکلین به تەواوی خۆی بۆ یەزدان تەرخان کرد، بلیز له کاروباری ئایین دوورکەوتـەوەو ڕۆیشت بـەلای کاروبـاری دونیـادا. ئەگــەرچی لـەنێو





مەزاج و پەروەردە ئایینیەکەیدا ڕێگرەبوو بۆ هەندێ خواست و ئـارەزوو، بـەڵام خۆیدایـە دەسـت حـەزو ئـارەزووی بـۆ زانسـت و گەڕایـەوە بـۆ نێـو کۆمـەڵگاو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، ڕەنگە پێوسـت بکـات بـە دوای هۆکاری گەورە بوونی ئـەم بۆشـاییەدا بگـەڕێین کـە ڕۆیشـتنی جـاکلین لـەلای دروسـت کـرد، هـەروەها هۆکاری باشبوونی ڕەوشـی جەسـتەیی بـە شـێوەیەکی کاتی. لانی زۆر پێدەچێ کەلـەو کاتـەدا ئـەم بابەتـەی نووسیبێ: "وتـارێك لـەبارەی ئارەزووەکـانی دل"[٣]. کـە ڤیکتۆر کۆزان لە کتێبخانـەی پادشـایی دۆزیبوویـەوە، بەڵام گومان لە ڕاستی ئەم نووسراوە دەکرێ.

بەمجۆرە لە ساڵی 1654 دا چالاکی زانستانەی دەسی پێکـردەوەو ئـەم دوو کورتـە لێکۆڵینەوەیـەی نووسـی: (لە بارەی هاوسەنگی شلەکان) و (لە بـارەی قورسـایی هـەوا). ئـەم دوو لێکۆڵینەوەیـەش لـەم کتێبەیـەوە کـورت کراونەتـەوە: (لیکۆڵیینـەوە لـە بۆشـایی) کـە هێشـتا بـە دەسـتمان نەگەیشـتووە. هاوکـات ئـەم دوو کتێبەیشـی نووسـی: (لێکۆڵینـەوە لـە سێگۆشـەی حسـابی) و (لێکۆڵینـەوە لـە ڕیزبـەندی ژمارەکـان). لەگەڵ (فێرما)شدا نامە گۆڕینەوەیەکی چالاك هەبوو





لـە نێوانیـانـدا سـەبارەت بـە تیـۆرەی ئەگـەرەکان (نظرية الاحتمالات).

هـەرچی جـاکلینی خوشـکێتی: (بـەداخ بـوو بـە بینینی ئەو کەسەی کە پوچێتی ژیـانی دونیـای پـێ پیشـانداو ئێسـتا خـۆی نغـرۆی خۆشـیە پوچەکەی بووە) وە زۆرجار هانی دەدا کە دەست لەو خۆشـیە هـەڵبگرێ، بـەڵام هێشـتا وادەی ئـەو وازلێهێنانە نەهاتبوو. پاسکال گوێی بـۆ خوشـکی شـل دەکرد بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا: (دەستی لـە پڕۆژەکـانی خۆیشـی هەڵنـەدەگرت). بـەڵام سـەردانە بەردەوامـەکانی بـۆ لای خوشـکی و، وتوویـژی دوورو درێژی لەگەڵیداو، ڕەنگە خراپبوونـی ڕوو لـە زیـادی ڕەوشی تەندروستی، هەموو ئـەم فاکتەرانـە وایـان لـە پاسـکال کـرد کـە تـێڕوانینێکی تـەواو تـازە بڕوانێتـە مەسـەلەکان. وەکـی (بۆتـرۆ)ش دەڵـێ: (هەسـتی بـە جیـاوازی زەبـەلاحی نێـوان بـارودۆخ و چارەنووسـی خۆی دەکرد). ئیـدی وتووێژەکـانی لەگـەڵ خوشـکیدا زیـاتر کـردو وەکـی خوشکەکەیشـی دەڵـێ: "ئـەم وتووێژانە بە جۆرێك دووبارە و دێژخایان بوون، کە وامدەزانی کارو پیشەمە".





لـه 23ی تشـرینی دووەمـی 1654دا، لـه کـاتی گـوێ گرتنـی بـۆ ئامۆژگـاری هێـزا سـانگلان، ڕۆشـنایيەکی سـەيرو ڕووناکيـەکی ناديـار بـەگيانيدا هـات. هـەر دەتووت ڕۆشنايیەکی بالآیـە مـاوەی دوو کـاتژمێر بـە گيانيدا تەشەنەی کرد. لەم کاتەدا چـاوی بـە خـودای پایە بەرز کەوت و هەستی بە شکۆمەندییەکەی کرد: بۆ ئەوەی ئەو بیروڕایانـەش بپـارێزێ کـه بـه سـروش بۆی هات، خێرا لەسەر پارچەیەك لە پێستە تۆمـاری کـرد کـه لـه دوای مردنـی لەسـەر جـل و بەرگەکەی دۆزرایەوە.

پاسـکال بـە ڕێگاپیشـاندەر هـەڵبژێردرا. سـانگلان ئامۆژگـاری کـرد کـه لـه دێـری پـۆر ڕۆیـال دی شـان بمێنێتەوەو، لە ماوەی تەنيايەکەيشيدا پاسکالی سپارد بە هێزا دی ساسی ڕۆژێك لەگەڵ دی ساسیدا پێکـەوە باسـی "ئـەبيکتيت"[5] و"مۆنتـانی"[6]يـان کـرد. هەرچيـەك کـەوا لانـی زۆر پێدەچـێ قسـەی پاسـکال بووبـێ دەربـاری ئـەبيکتيت و مۆنتـانی، "فۆنتـين"ی یاریدەدەری دی ساسـی تۆمـاری کـرد. نەقڵکردنەکـەی فۆنتـين هێنـدە زینـدووە هـەر دەڵێـی گوێبيسـتی قسەوباسـی پاسـکالين دەربـارەی "گفتوگـۆی هێـزا دی ساسی سەبارەت بە ئەبيکتيت و مۆنتانی".





وەك چۆن لـە مـاوەی یەکـەمی تۆبەکردنەکـەیدا ویسـتی خوشـك و بـاوك و هـەموو ئـەندامانی خێزانەکـەی قەناعـەت پێبکـات، ئـەم جـارەیش بـە هەمان شـێوە ویسـتی هاوڕێکـانی خـۆی لـە نموونـەی: دۆق دی ڕوانـیز، دۆمـاو کەسـانێکی تـر بێنێتـە سـەر ڕێگـای خواپەرسـتیو، وازی لـە لێکۆڵینـەوە زانستیەکانیشـی هێنـا تـاوەکو هـەموو بیرکردنـەوەی خـۆی کۆبکاتـەوەو ئـەم کتێبـە گەورەیـە بنووسـێ: "ستایشی مەسیحیەت"* بۆ دەمکوتکردنی بێباوەڕان و گێڕانـەوەیان بـۆ سـەر ئایین. بـەڵام بەڕێوەبـەرانی پـۆر ڕۆیـال داوایـان لێکـرد کـە شـێوازێکی تـازە بدۆزێتـەوە بـۆ ئـەوەی خوێندنـەوە فـێری منـداڵان بکـات کتێبێکیـش دەربـارەی ئـەندازەی سـەرەتایی بنوسێ. ئێستا دوو برگەی ئەو کتێبـە بـە ناونیشـانی "لـەبارەی هـزری ئـەندازەیی" ئـەوەتان لەبەردەسـتی ئێمـەدان، بـەڵام جێبـەجێکردنی هـەموو پرۆژەکانی دواکەوت.

---

* سەرنج و تێبینیەکان لەسەر کۆمەڵە کاغەزێك تۆمارکران و دواتر ناوی (ئەندێشە)یان لێنرا.





لـە كـانوونی دووەمـی 1655دا قوربـانیی پـیرۆز نەدرایـە دەسـت هێـزا "دی لیۆكـۆر" چونكـە ئـەركی پـەروەردەكردنی كـوڕە بچكۆلانەكـەی خـۆی دابـووە دەست دێری پۆر ڕۆیال. ئەوكاتە "ئارنۆ"[7] كەیەكێك بـوو لـە بەڕێوەبـەرانی پۆڕۆیـال، یەكـەمین پـەیامی ئاراستەكراوی بـۆ یـەكێك لـە خانەدانـەكان دەربـارەی ئەم مەسەلەیە بڵاوكردەوە. مەسیحیەكان بـە تونـدی هێرشیان كردە سەر ئەم نامەیە، ئـەویش بـەم جـۆرە وەڵامی دانەوە:

مینبـەری پەیامبـەری هـەر پێنـج مەسـەلەكەی جانسینیوس ی سەرزەنشت كردووەو ئەو مل بۆ ئـەم فەرمانـە دەدات، بـەڵام سـەرنجی بـۆ ئـەوە ڕاكێشا كـە مەســەلە پرۆتیســتۆكراوەكان لـــە كتێبەكـــەی جانسینیوسـدا نـەهاتوون. ئیـدی ئـارنۆ نێردرایـە كۆلیـژی لاهـوت. كۆلیـژی نـاوبراویش بـە پاڵپشـتی مـیری و بـە تایبـەت مەسـیحیەكان ئـارنۆی پرۆتیستۆكرد، ئەمەش دوا بە دوای مانۆڕگـەلێك كـە هـانی "ڕاسـین"[8]ی دا كـە بڵـێ هـەرگیز تـا ئێسـتا فەرمانێكی كەم ڕەواتر لەم فەرمانە دەرنەچووە.

سەرزەنشتكردنەكەی ئارنۆ تەنـها لایـەنی واقیعـی دەگرتـەوە، بـەڵام لـە لایـەنی یاساییەوە هـەروەها لـە





پۆرڕۆیالیش باوەڕ بە دروستایەتی سەرزەنشتەکە دەکرێت، ئیدی تکایان لە ئارنۆ کرد کە مەسەلەکە پێشچاوی جەماوەرەکە بخات کە گرنگی بە مەسەلەکە دەدا بێ ئەوەی ئاگاداری هەموو کەین و بەینەکانی بێت، لێرەدا پاسکال ڕاسپێردرا تاوەکو شتێك بۆ جەماوەرەکە بنووسێ، ئەویش ئەم نامەیەی نووسی: "یەکەمین پەیامی ئاراستەکراو بۆ لادێییەك لە لایەن یەکێك لە هاوڕێکانیەوە"، ئەم پەیامە لە 27ی کانوونی دووەمی 1656 لەژێر ناوی "لوی دی مۆنتال"ی خوازراودا بڵاوکرایەوە. لە پاش چوار ڕۆژان سۆربۆن ئارنۆی پرۆتیستۆکردو ناویشی لەنێو لیستی لاهوتیەکاندا کوژاندەوە، لە 5ی شوباتدا پەیامی دووەم دەرچوو، دوای ئەوە بە هەفتەیەك سێیەم بڵاوکرایەوە، لە دوای چەند ڕۆژێکیش پەیامی چوارەمی بەدوادا هات.

وێڕای هەوڵ و ڕاڤەکانی ئارنۆ، گرووپی پۆر ڕۆیال ناچاربوون کە بڵاوەی لێبکەن و بە بڕیارێکی شاهانەش دەرگای خوێندنگاکانیان کڵۆم درا. مارگرێت بیرێ کە یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەم گرووپە بە داخستنی خوێندنگاکە داخی نەدەچوو. لە





24ی ئـادارددا هـەموو دانیشـتوانی دێرەکـە لـە دڕکێــك نزیـك دەبوونـەوە کـە لـە پاشمـاوەی تاجــە گوڵینــەی (مەسیح)ەو وەرگیرابوو لە لایەن یەکێك لە باوکانەوە کـەتا ئــەو کاتــە لــە کلێســا تایبەتەکــەی خۆیــدا پارێزگاری لێدەکرد، گەرێنرابۆوە بۆیان. وەختێك کە نـۆرەی کڕنـووش بـردن هاتـە ســەر مــارگرێت دڕکـە پیرۆزەکە بەرچاوی کـەوت و دەسـبەجێ چاوی چاك بـۆوە. لـە ڕۆژانـی دواتریشـدا چــەند موعجیزەیــەکی هاوشێوە ڕوویاندا وایان کرد کە باوەڕ بهێنرێ بەوەی کە خودا بە میهرەبانی خۆی پۆڕڕۆیالی هەڵبژاردووە، چونکـە لەوەوبــەر دڕکـە پیرۆزەکــە ئــەم چەشــنە ڕووداوانەی دروست نەکردبوو؛ دەرەنجـام دانیشـتوانی دێرەکـە توانیـان بگەڕێنـەوە بـۆ پۆڕڕۆیـال دی شـان و خوێندنگاکانیشیان کەوتنەوە کار.

بەڵام پاسکال لە موعجیزەی دڕکـە پیرۆزەکـەو لـە چاکبوونــــەوەی مــــارگرێت دا، وریاکردنەوەیــــەکی خودایـی دەبینـی و پـێی وابـوو کــە بــە تایبــەتکاری ئاراســتەی ئــەو کــراوە، هــەروەها بــە جۆرێــك لــە پەسەندکردنی نووسینەکانی خۆیـی دەبینـی لەلایـەن خـوداوە. ئیـدی لـە هێرشـەکانی خـۆی زیــاتر کــرد و پێنجـەمین پــەیامی ئاراســتەکراو دژ بــە ئــەخلاقی





مەسـیحییەکانی دەرکـردو، بــە دوای ئەویشـدا پێنــج پـەیامی دیکـەی دەرکـرد. پـاش ئـەوەی ڕەخنــەی لـە ڕێبازی ئەخلاقییان گرت ئەوجا لە پەیامەکـەی تـردا پـەلاماری سیاسـەتەکەیانیدا. بـۆ ئـەوەی کـە تۆمـەتی (بدعـة)یـش لــە پۆڕڕۆیــاڵ دووربخاتــەوە، لــەکانونی دووەم و ئاداری 1657 دا دواین دوو پەیامە گوندیەکانی خۆی نووسی.

ئەم هەڵمەتــە وای لـە بەشـێکی زۆر لـە خـەڵکی و ژمارەیەکی زۆر لە کەشیشەکانی کەشیشایەتی پاریس کـرد کە پشـتگیری پۆڕڕۆیـاڵ بکـەن، بـەڵام نـەیتوانی ڕێگــا لــەوە بگــرێ کــە ڕاشــکاوانە سەرزەنشــتی جانســـینیوس نـــەکرێ. پەیامـــە گوندییـــەکانیش بـــەمجۆرە تەماشـــاکرا: "کتێبێکـــە پـــڕ لـــە زەم و ناوونـــاتۆرا، فرۆشـــتن و پڕوپاگـــەندە بـــۆ کردنـــی قەدەغەیـەو هەرکەسـێك سـەرپێچی بکـات ڕووبــەڕوی بەندکردن و کاری قورس و گران دەبێتەوە".

وەك وتمـان پاسـکال پەیامــە گوندیــەکانی لــەژێر ناوێکی خوازراودا بڵاوکردەوە لە ترسی ئەوەی نەبادا لـــە لایـــەن نـــەیارە بەهێزەکانیـــەوە تۆڵـــەی لێبسەندرێتەوە، لەبــەر هـەمان هۆکـاریش ناچـار بـوو





لە 1655 و پاشان لە 1656دا شوێنی دانیشتنی خۆی بگۆڕێ، چەند جارێك (لە دەرەوەی دەروازەی سان میثال و لە نزیك دەروازەكە) و ئینجا لە شەقامی بواریێدا نیشتەجێ بوو.

پەرج و موعجیزەی دڕكە پیرۆزەكە ئاپۆڕایەك لە خەڵكی بەلای پۆرڕویال دا ڕاكێشا. خاتوو دی ڕوانیزی خوشكی دۆق دی ڕوانیزی هاوڕێی پاسكال یەكێك بوو لەو كەسانەی كە هاتن بۆ ئاین پەروەری و خواپەرستی. ناوبراو تەمەنی بیست و سێ ساڵانە بوو تاوەكو ئەو كاتەش تەنها بیری بەلای دونیاوە بوو. وەختێك كە بوون بە ڕاهیبەی هات بە خەیاڵدا مەسەلەكەی لەلای پاسكال باسكرد. بەڵام پڕۆژەكەی لە لایەن دایكیەوە بە توندی بەرهەڵستی كرا ئیدی ئەویش چوو بۆ (پواتێ) و بەردەوامی نامەی بۆ پاسكال دەناردو باسی ئامادەی شاراوەی خۆی بۆ دەكرد بۆ بوون بە ڕاهیبە. بۆ بەدبەختی ئێستا ئێمە تەنها بەشێك لەو نامانەی پاسكالمان لەلایە كە خاتوو دی ڕوانیز لەلای خۆی پاراستبوونی و دوای گەڕانەوەی بۆ نێو ژیانی كۆمەڵایەتی و شووكردنی لە پاش كۆچی دوایی پاسكال، وەك نەریتێك دەچووەوە سەریان و دەیخوێندنەوە. ناوبراو ژیانێكی





خەمۆکانـەی بـردە سـەرو زۆرجــار داخ و حەســرەتی هەڵدەکێشا چونکە بەو چەشنەی کە خـۆی دەیویست نەچووە سەر.

پاسکال لە ئاراستەکردنی خەڵکیدا کەسێکی تەواو بلیمەت بوو. زۆرجار (خەڵکانی گەورە هـزرو خـاوەن توانــا دەچوونـــە لای و پابـــەند دەبـــوون بـــە ئامۆژگایەکانیەوە. هەروەها کەسانێك هەبوون کە لـە پــرس و مەســەلەی ئـــایین دا دوودڵ بـــوون، بـــە مەبەسـتی ڕاوێـژ سـەردانیان دەکــرد و هەمیشــە بــە ڕەزامەندییـەوە لای ئـەویان بەجێدەهێشت.) پاسـکال بـۆ دوورکەوتنـــەوە لـە خراپــەکاریش بـە هـاندەری ویـژدان ڕاسـتەوخۆ قایشـێکی دڕکـاوی بـە ڕووتـی لــە کەمـەری دەبەست. هـەرکاتێك (هەسـتی لـە خۆبـایی بـوون دایبگرتایـە بـە ئانیشك لەســەر پشـتوێنەکەی دەدا بـۆ ئـەوەی لـە هەڵچـەقینی دڕکەکـە توندتــر بکات و ئەرکی خۆی بیربکەوێتەوە).

ئـەم ئەشـکەنجەیە بـەس نــەبوو بـۆ ئــەم خـودە نائارامە بۆ بەرەو پێشچوون لەســەر ڕێگـای یـەزدان و خواپەرسـتی، هـەر بۆیـە وەك چـاوکردن لـە مەسـیح عــەودالی برسـێتی بـوو، وازی هــەموو پێویسـتیەك





هێناو نەیدەویست بایەخی زۆری پێ بدرێو دەیووت: (مـن ئامـانجی هیـچ کـەس نیـم، چونکـە چارەنووســم مردنـە). زانستەکانیشـی بـە مەسـەلە گـەلێکی پـوچ و بـێ مانـا تەماشـا دەکـرد، چیـدی تەنـها بـە ئـەندازەی کـەڵکیان لــە چـالاککردنی خواپەرســتیەکەیدا ڕێــزو حورمـەتی لێدەنـان. بـاری تەندروستیشـی تـا دەهــات خراپـتر دەبـوو، تووشـی سەرئێشــەی بــەردەوام بــوو، بـــەڵام شــــانی دایـــە بـــەری و بەڵکـــە تەنانـــەت بەختەوەرانە بەم حاڵەی خۆی قایل بوو، چونکـە لـە خودای نزیك دەکاتەوە.

بە وتەی مارگرێت بـیرێ ڕۆژێـك پاسـکال تووشـی ددان ئێشـــەیەکی زۆر بـــوو کـــە خـــەوی شـــەوی لێ حـــەرامکرد. (لــە ســاتەکانی بێداریــدا بیرۆکەیـــەکی ســـەبارەت بـــە بازنـــە (الدائـــرة الـــدوارة)ی هـــات بـــە خـــەیاڵدا). لـــە مـــاوەی چـــەند شـــەوێکدا، لـــە بیرۆکەیەکـــەوە چـــووە ســـەر یـــەکێکی دی هـــەتا چارەسـەری ئـەو مەسـەلەیەی دۆزییـەوە کـە باوکـە مرسین تەرحی کردبوو.

ئـەم مەســـەلەیە پەیوەســـت بـــوو بـــە بابـــەتی هاوکێشـەی بازنـە la quaderature de la rou lette چەماوەی بازنە CyCloide. "ئەم ناوە بـەو چەماوەیـە





دەوترێت کـە خـاڵێك لـە بازنەیـەك دەیكێشـێ کـە لەسەر ڕاستەهێڵێك دەخولێتـەوە"* . ئەگـەر دۆق دی ڕوانـیز ئـەوەی بـۆ پاسـكال بـەیان نەکردایـە کـە پێویسـتە ئـەنجامی لێكۆڵینـەوەکانی خـۆی بـۆ بـەرژەوەندی ئـایین ڕابگەیـەنێ و ئـەوەش بـۆ بێباوەڕان بسەلمێنێ کە لانـی کـەم هێنـدەی زانـایی ئەوان لە هەموو ئەو مەسەلانەدا زانایە کە دەکرێ بە بەڵگە بسەلمێنرێ، ئەگەر دۆق وەهای نەکردایـە ئـەوا پاسکال لێدەگەڕا بەری تێڕامانەکانی بەخەسار بچێ. ئینجـا بـۆ ئـەوەی سـەدایەکی گـەورەش بـدات بـە مەسـەلەکە، پاسـكال بـە گوێـرەی ئـەو ئامۆژگاریانـەی کە پێی درابوو پێشبڕکێیەکی ڕێكخسـتن کـە خـەڵاتی بڕێك پارەی لەگـەڵدا بـوو، ئـەم خەڵاتـە ئـەدرێت بـە هەرکەسێك کە چاری مەسـەلەکە دەدۆزێتـەوە. بـەڵام هیـچ کـەس نـەیتوانی چارەسـەری تـەواو بـدات بـە دەستەوە. ئیدی ئەوکاتە پاسکال سەلماندنەکەی خۆی بڵاوکـردەوە کەلـە مـاوەی هـەژدە ڕۆژدا نووسـی. لـە کاتی چاپكردنیشیدا دووان لە کرێکارانی چاپخانەکان ئـەو وشـانەی کـە ناوبـەناو دەهاتـە بەردەسـتیان بـە

---

* بێ ئەوەی کە هەڵبخرێ (و. عەرەبی).





بابەتی ئامادە بۆ چاپیان وەسف دەکرد. پاسکال لە حەلکردنی ئەم هاوکێشیەدا شێواز گەلێکی ئەوتۆی بەکارهێنا کە دەکرێ بڵێین ناوبراو یەکێکە لە دۆزەرەوەکان حسابی تەواوکاری و جیاکاری "التکامل و التفاضل". هەروەها پاسکال پرۆژەیەکیشی دانا بۆ گواستنەوەی هاوبەش لەنێو شاری پاریس داو، حەزی دەکردکە سودو قازانجی ئەم کارە بۆ هەژارانی "بلوا" تەرخان بکات. ئەوە بوو سەرەتا مەسەلەکە بە چاکی بەرێوەچوو، بەڵام بەرهەڵستیکردنی لەلایەن هەندێ لە خاوەن بەرژەوەندییەکانەوە پرۆژەکەی فەشەل پێهێنا.

لە 9ی ئاداری 1661دا (مازاران)[9] کۆچی دوایی کرد. دوای چەند رۆژێك لە مردنی ناوبراو جارێکی دی رێو شوێنی توند لە دژی پۆررۆیال کە دوابەدوای موعجیزەی درکە پیرۆزەکە بە هۆی دەستێوەردانی شاژن و کاردیناڵەوە تەواو راوەستابوو، پەرەی سەندەوە. لە پاش پرۆتیستۆکردنی جانسینیوس یش بەیاننامەیەك ئامادەکرا کە دەبوو هەموو دانیشتوانی پۆررۆیال بۆ دەربڕینی رەزامەندی خۆیان لەسەر ئەو پرۆتیستۆیە ئیمزای لەسەر بکەن. ئیدی پۆررۆیال پارس بە گوێی ئامۆژگاری ئارنۆیان کردو





بەیاننامەکەیان ئیمزاکرد، بـەڵام پۆرڕیـال دی شـان و بــە تایبــەت جـاکلین پاســکال ملــی نــەداو نووســی: "لەبەرئەوەی کە مەترانــەکان وەکـی ژنـان دلاوەریـن، دەبێ ژنانیش وەکـی مەترانـەکان ئـازابن". بـەڵام بـە هۆی دەستێوەردانی چەند لایەنێکەوە بە پێچەوانەی خواستی جاکلینەوە ئیمزا لەسەر بەیاننامەکـە کـراو، ئەویش لە دوای سێ مـانگ لـەو ڕووداوە لـە تەمـەنی سـیو شــەش ســاڵیدا کۆچـی دوایــی کــرد. جــاکلین خۆشەویســترین کەســی پاســکال بــوو، وەختێــك کــە پاســکال هــەواڵی مردنەکـەی بیســت هــەر ئــەوەندە لەســەری دووا کـە وتـی: "خـودا ئـەو چەشـنە مردنــە چاکە بە ئێمەومانانیش ببەخشێ".

لـە دوای ئیمزاکردنــی بەیاننامەکــە، دوژمنـــانی پۆرڕۆیال ویستیان زیاتر پرۆتیسـتۆی جانسـینیوس و بنەمای یارمەتی کارا "العون الفعـال" بکرێـت. ئیـدی لــەم کاتــەدا پاســکال ئەمــەی ڕەتکــردەوە کــە بــە پێچەوانەی ڕاستگۆیەتی مەسیحیی دەزانی کـە دەڵـێ: پێویســتە بــە گوێــی خــودا بکــەین بێئــەوەی کــە چاوەڕوانی ئەنجامی گوێڕایەڵیەکەمان بین. بـەڵام لـە مشتومڕێکدا کە لە نێوان پاسکال و لــە نێـوان ئـارنۆو





نیكۆل و كەسانێكی تری سەردارانی  پۆرڕویاڵ دا كرا پاسكال گوناهبار كرا. ئەودەمە  پاسكال هەوڵی زۆری دابوو بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیەكەیدا تاوەكو ئامادەی كۆبوونەوەكە بوو، وەختێكیش چاوی كەوت بە: "شلۆقی ئەو كەسانەی كە خودا بەزانینی هەقیقەت خۆشیویستن و پێویستە داكۆكی لێ بكەن" ئیدی بورایەوەو لە هۆش خۆی چوو.

باری تەندروستیشی خراپتر بوو. "بەردەوام نەخۆش دەكەوت". چیدی نەتوانای ئیشكردن و نە توانای بینینی كەسی نەما، هەر بۆیە خرایە ژێر سیستەمی چاودێری وردەوە. هەرچەندە "هەستی بە قێزو بێز دەكرد" بەڵام هەرچیەك كە داوای لێكرا بیخوات پەسەندی كردو خواردی. بەردەوام  خەریكی كپكردن و دامركاندنەوەی هەستەكانی خۆی بوو، لە جاران زیاتر دەست گیرۆیی هەژارانی دەكرد.  بەر لە مردنی بە  سێ مانگ تووشی كیژێك بوو كە داوای خێری لێكرد. كیژەكە  ماوەیەك بوو باوكی مردبوو دایكیشی لە نەخۆشخانەی "ئوتێل دیو" كەوتبوو. پاسكال بە مەرجی ئەوەی كە ناوی نەبرێ بژێوی كیژەكەی دابین كردو ئەركی بەخێوكردنەكەیشی سپارد بە مەترانێك. هەروەها لە ماڵەكەی خۆیدا





میوانــداری "پیــاوێکی ســادەو ســاکارو خــێزان و منداڵەکانی کـردو هۆدەیـەکی بـۆ تـەرخانکردن و بـێ پاداشـت و لـە ڕاهـی خـودا دارو چیلکـەی سـوتاندنی پێدەدان".

لـە دوای تێپـەڕبوونی سـێ ڕۆژ بەسـەر مانـەوەیدا لەلای خوشکەکەی، ڕیخۆڵەی تووشی ئێـش و ئـازارێك بوو کەبە هیچ شتێك ڕانەدەگیرا. ئەویش لـەم کاتـەدا پـێ لێناو ویسـتی قوربـانیی پـیرۆز وەربگـرێ. بـەڵام پزیشکەکان ڕێگەیان پـێنەدا چونکە نەیاندەویست کە بە ڕۆژو بێت. هەربۆیە ئەویش لەم کاتەدا داوای کرد کە کەسێکی هەژاری نەخۆش بهێنرێو لـە لایـەوە لـە هـەمان هـۆدەدا بخـەوێنرێ و هـەمان مامەڵـەی ئـەوی لەگەڵدا بکرێـت. لەبـەر ئەسـتەمێتی جێبـەجێکردنی ئەم داخوازیە ویسـتی بیگوێزنـەوە بـۆ نەخۆشـخانەی نەخۆشیە بێچارەسەرەکان بۆ ئەوەی لەوێندەر لەنێو هەژاراندا بمرێ. ئیدی تـا دەهـات ئێـش و ئازارەکـانی توندترو سەر ئێشەکەیشی زیادی دەکرد. لە حەڤدەی مانگی ئاب دا داوای کرد کە پشکنینێکی پزیشکیی بـۆ بکرێت بەڵام هەر لەدەست ڕاڕایـی ڕزگـاری نـەدەبوو. لـە دوای پشـکنینەکە پزیشـکەکان دڵنیایـان کـرد کـە





هیچ مەترسیەك لەسەر ژیانی لە ئارادا نیەو ئـەویش متمانەی بە قسـەكانیان نـەكردوو تكای لـە كچەكـەی خوشكەزای خۆی كرد كـەبنێرێ بـە دوای یـەكێك لـە پیـاوانی ئـاینیدا بـۆ ئـەوەی بێـت شـەو بەدیاریـەوە بمێنێتەوە. لە دەوروبەری نیوەشەودا لـەرزێكی تونـد دایگـرت، دەوروبەرەكـەی وایـانزانی كـە بـەبێ وەرگرتنی نهێنیەكانی قوربانیی پیرۆز گیـانی سـپارد. بـەلاّم پـاش ماوەیـەك وەك بلـێی بـە قودرەتـی موعجیزەیـەك لەرزەكـە نـەماو هاتـەوە هۆشـی جارانی خۆی.

پاسـكال لـەم حالـّەدا بـوو كـە كەشیشـەكە بـە قوربانیـە پیرۆزەكـەوە هاتـە ژوورەوەو وتـی: "ئـەوەتا ئەو شتەی كە داوات كرد". پاسكالیش هەستایە سـەر ئەژنۆ، وەختێكیش كە كەشیشـەكە لـە بـارەی نهێنیـە سـەرەكیەكانی ئیمـان پرسـیاری لێكـردن لـە وەلاّمـدا وتـی: "بـەڵی گـەورەم، بـە هـەموو ئـازای گیانمـەوە ئیمانم بە هـەموو ئەوانـە هەیـە". ئینجا بـۆ دواجـار دەسـتی هێنـا بـە سـەریدا extremeonction و ئـەویش سوپاسی كەشیشەكەی كردو وتی: "دەبـا هەمیشە لـە پـەنای خـوادا بم". جارێكی دی لـەرزی بـۆ هاتـەوەو لەرزەكە درێژەی كێشا هـەتا لـە دوای بیست و چوار





کاتژمێر لە 9ی ئابی 1662 و سەعات یەکی سەر لە بەیانی تەمەنی سی‌و نۆ ساڵ و دوو مانگیدا کۆچی دوایی کرد.

لە توێکاری کردنی لاشەکەیشیدا دەرکەوت کە لە هەناویدا تووشی گانگرین بووبوو. هەروەها پزیشکەکان بەدییانکرد کە پاسکال خاوەن مێشکێکی زەبەلاحە. هاوکات لە هەناویدا: "لە بەردەم سکۆڵەکاندا دوو خاڵی پڕ لە خوێنی مەیوی بۆگەن کردوو لەگەڵ سەرەتای تەشەنەسەندنی گانگرین)یان بەدیکرد.

پاسکال لە وەسیەتنامەکەیدا نووسیبووی: (حەزدەکەم لەسەر خواستی خۆم لە کلێسای سانت ئیتیان دۆ مون لە شاری پاریس بنێژرێم). ئیدی رۆژی دوو شەممە بەرواری 21ی ئاب کاتژمێر دەی سەرلەبەیانی لەسەر خواستی خۆی لە کلێسای سانت ئیتیان لەلای خوارووی یەکەم کۆڵەکەی میحرابەکەدا بە خاك سپێردرا.





# نەسكی دووەم

## فەلسەفەی پاسكال

ئەگەر فەیلەسوف كەسێك بێت كە لە لایەك رێبازێكی توندوتۆڵ دابنێ‌و، لە لایەكی تر توانای پێشكەشكردنی چارەسەری بۆ هەموو ئەو مەسەلانە هەبێ كە لە توانای چارەسەردان، ئەوا بێگومان پاسكال فەیلەسوف نیە. بەڵام وەكی ئە. رێنان دەڵێ ئەگەر: (بیر بایەخێكی پیرۆزانە بە هەموو شتێك بدات) و بیرمەند (هەرچیەك بێت بابەتی بیركردنەوەكەی)، ئەوا پاسكال نەك هەر فەیلەسوفە بەڵكە یەكێكیشە لەو كەسانەی كە دروست خاسیەتێكی بەرهەمەكانی ئەوەیە كە زیندوو پڕ واتان.

بە باوەڕی ئێمە تەنها ئەو كاتە دەتوانین بیرۆكەیەكی گشتی دەربارەی ئەم بەرهەمە گەڵاڵە بكەین كە تیایدا دووبەش لە یەكدی جیابكەینەوە





بەم جۆرە: بەشێك، گەر ڕاستبێ بڵێین، سەرەکی کە دواجار ڕۆشنترین تێڕامان و دیارترین ئەندێشەکانی لە دەوری ڕیز بوو، بەشێك، گەر ڕاستبێ بڵێین، لقەبەش کە تیایدا ژیرانەو چابوکانەو بە ڕەوانبێژیەکی دانسقە لاقەی کۆمەڵێك بابەتی فرە چەشن دەکات.

ئێمە لەم کتێبەدا بە تایبەتکاری بایەخ بە بەشی سەرەکی بەرهەمەکانی پاسکال دەدەین، چونکە بەشە لاوەکیەکان پێویستیان بە شیکردنەوە و ڕاڤەکردن نیە.





## بەشی یەکەم

## تەوەری بایەخدانەکانی پاسکال:

## ئەخلاق

با سەرەتا هەوڵبدەین تەوەری بایەخدانەکانی پاسکال هەڵێنجین.

پاسکال بە شێوەیەکی تەواو ڕۆشن ئەوەی بۆ بەیان کردووین. گرفتی سەرەکی سەبارەت بە مرۆڤ ئەوەیە کە بزانێ پێویستە چۆن چۆنی هەڵسوکەوت و ژیانی خۆی ڕێکبخات. جا ئەگەر هەموو شتێك بزانێ‌و لەم خاڵە نەزانێ ئەوا جوانیی (کمالی) دەستگیر دەبێ و پێداویست (ظروری) لە کیس دەچێ. ئەگەریش تەنهاو تەنها پێداویستی دەستگیر بوو ئەوا گەنجینەیەکی دەستخستووە کە ئیدی پێویستی بە هیچ شتێکی دیکە نابێ. "لە زانستی شتە دەرەکیەکاندا شتێك بەدی ناکەم کە لە کاتی تەنگانەدا دڵنەوایی نەزانیم لە ئەخلاقدا بداتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە زانستی ئەخلاقدا شتێك بەدی دەکەم کە دڵنەوایی نەزانیم لە شتە





دەرەکیــەکاندا بداتــەوە". کەواتــە تەنــها هــەر ئـــەم زانستە شایانی بایەخدانە.

لە ڕاستیدا زۆربەی ئەو فەیلەسوفانەی کە پێش پاسکال هاتن دەرکیان بەم مەسەلەیە کرد. بەڵام ئەوەی کە بۆ ئەوان نەڕەخسا چی بوو؟

## فەیلەسوفانی دێرین

فەیلەســوفانی کــۆن ڕوبــەڕوی ئــەم مەســەلەیە بوونەتــەوەو پەرۆشی ناساندنی چاکەی باڵا "الخـیر الأسمـــی" "SouverainBien" بـــوون بـــە هـــۆی ئامرازگەلێکی ئەقڵانیەوە. بەڵام تەنها تاقە یەك ئەنجامیان دەستگیر بووە کە ئەویش ئەمەیە: بە جیاوازییـان لـە بۆچوونـدا دەریانخسـت کـە تـەواو بێتوانان لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەدا.

پاســکال ئـــەو پێناســـە هەمـــەجۆرو لێکدژانـــە دەهێنێتـەوە یاد کە ئـەو فەیلەســوفانە پێشـنیاریان کـردووە، ئینجا سەرسامی خـۆی دەردەبـڕێو دەڵـێ: "یـەکێك لــەو فەیلەســوفانە دەڵـی چاکـەی بـاڵا لـە ڕەوشــت بەرزیدایــە، یــەکێکی تــر پـــێی وایـــە لـــە لەزەتدایــەو، یــەکێکی دی لـــە زانســـتی سروشـــت و،





کەسێك لە حەقیقەت و، کەسێکی تر لە نادانی تەواوو، کەسانێکی تر لە بەرەنگاربوونەوەی دیاردەکان و، بە بڕوای هەندێکی تر لە تێڕانەمان لە هیچ شتێکدایە. گومانخوازە ڕاستەقینەکانیش باوەڕیان وایە کە لە دڵنیایی و گومانی بێبڕانەوەدایە.

کەسانێکی تریش پێیان وایە کە بە ئەنجامێکی باشتر گەیشتوون. پەکوو لەو ئەنجامە!"

### فەیلەسوفانی نوێ

هەرچی فەیلەسوفە تازەکانیشە بەختیان لە بەختی دێرینەکان باشتر نەبوو.

مۆنتانی بەپێی پێویست و بە توندی ڕەخنەی لە ئەقڵی مرۆیی گرتووە، بەڵام لە مەیدانی زانستی ئەخلاقدا سست و لاواز بووە. چونکە ئەوەتا ستایشی (نادانی و دوورەپەرێزی) و مەیلی حوکمدان لەسەر چاکە خوازی و خراپەخوازی بە گوێرەی دیاردە سەرەتاییەکان و دڵسۆزیی بۆ سوننەتێك دەکات کە تەنها لەبەرئەوەی سوننەتە بۆیە دەبێ پێڕەو بکرێ.





ئەمە بە بڕوای پاسکال لوتکەی بێئەخلاقییەو، شایانی چەخماخەی توڕەبوونێتی. لە کاتێکدا کە دیکارت دەخوازێ لە ڕێگای میتافیزیکایەکەوە مەسەلەی ئەخلاق چارەسەر بکرێ کە ڕێگای دانانی فیزیایەك بدات و ئەم فیزیایەش بواربدات بە دامەزراندنی میکانیك و پزیشکیی و زانستی ئەخلاق. مادامەکی ئێستایش مەسەلەکە بەو جۆرە نیە، دەبێ بە ئەخلاقێکی کاتی بەس بکەین. بەڵام هاوکات خاسیەتێکی دیکارت ئەوەیە کە (نەزۆك و سەرسام)ەو لە خواپەرستیەکەیدا بەدگومانە: "حەزی دەکرد گەر بیتوانیایە لە هەموو فەلسەفەکەی خۆیدا دەستبەرداری خوابێت، بەڵام پێویستی بە پاڵنەرێکی بزوێنەر هەبوو". کەواتە با لەم چەشنە ڕێگایانە دووربکەوینەوە.

سەبارەت بە گەورە نوێنەرانی ئەخلاقی مەسیحیی، هەقی خۆیانە کە مەسیحیی بن بەڵام هەندێکیان پێیان وابوو کە دەبێ بۆ گونجاندنی ئیمانی مەسیحیی خۆیان، بیناگەلێك لە بەناو مشتومڕی ئەقڵانی دابمەزرێنن. ئەمانە پێیان وابوو کە کۆمەڵێك بەڵگەی فەلسەفیان پێیە لەسەر بوونی خودا، نەمریی ڕۆح و، خەسڵەتی پیرۆزیی هەستی





ئەخلاقی و پاشان لەسەر پێداویستی بوونی ڕێسای هەڵسوکەوتێکی دیاریکراو. وایاندەزانی کە بەم شێوەیە خزمەتی ئایین دەکەن، بەڵکە تەنانەت هەندێکیان زۆر لەمەش دوورتر ڕۆیشتن، ئەم هەندە نەك هەر بە هیوای ئەوە بوون کە ڕێبازێکی تر شانبەشانی ئایینی باو دروست بکەن کە باوەڕی بە بوونی خودا هەبێ‌و باوەڕی بە بوونی وەحی نەبێ، بەڵکە ئومێدیشیان وابوو کە ئایینی باو لاببرێ و ڕێبازی ناوبراو* لە جیاتی دابنرێ.

گومان لەوەدا نیە ئەو کەسانەی کە بەم ئاراستەیەدا دەڕۆن لە خەڵکانی نیازپاکن. بەڵکە گومانیش لەوەدا نیە کە هەندێ لە بەڵگەکانیان بەسە بۆ ئەو کەسانەی کە پێشان ئیماندار بوون چونکە دڵ و دەروونیان بە ئیمان ئاوەدانە. بەڵام بۆ بێ‌ئیمانە گومڕاکان چ بەهاو نرخێکی هەیە؟ لە ڕاستیدا کڵێسا سەرزەنشتی ئەم ڕێبازە دەکات و بە ئەندازەی (قینی لە کوفر) قینی لێیەتی‌و، لەمەدا لەسەر هەقیشە.

---

* deisme ڕێبازی خواوەندێتی، ئەوانەی کە باوەڕیان بە بوونی وەحی نیە.





لەسـەر هەقــە. لـە لایـەك چونكـە لـە ڕاسـتیدا مشـتومڕەكانی خاوەنـــەكانی ئــەم ڕێبــازە ئێجگــار سست و لاوازە، چونكـە ئاشـنایی خۆیـان بـە سروشـت دەكەنە خاڵی دەستپێكردن و بە سـەرنج ڕاكێشـان بـۆ ئاسمان و (مەل و باڵندەكان) لافـی سـەلماندنی بوونـی خـودا لێـدەدەن. پاسـكال دەڵـێ: "ئەگـەر مـن سەرسـام بم، بە جورئەتی قسەو باسی ئــەو كەسـانە سەرسـامم كە باسی خوا دەكەن. وەختێك كە ڕووی قسە دەكەنە بـێ ئیمانــەكان، بـــە بەڵگەهێنانـــەوە لەســـەر ئـــەو بونەوەرانـەی كـە لـە سروشـت دان دێـن و خودایـەتی (الالوهیـة) دەسـەلمێنن، ئەوانـە ئەگـەر قسـەكانیان ئاراساتەی ئیمانداره چاكەخوازەكان بكردایە ئەوكاتـە من لە هەوڵەكانیان سەرسام نـەدەبووم. چونكـە هـەر كەسـێك كـە دڵ و دەروونـی بــە ئیمـان ئـاوەدان بـێ دەسـبەجێ دەزانـێ كـە هـەرچی شـتێ كـە لـە بوونـدا هەیە دروستكراوی دەستی خودایە، بـەڵام بـۆ ئـەوەی كە گومڕاكان بێنە سـەر ڕێگای ئیمـان، ئێمـە بێـین و بڵێـین سـەرنج لـە سادەترین شـت بـدەن بــە ئاشـكرا ڕووخساری خودای تیادا بەدی دەكەن و..





تاقە بەڵگەیەکیشمان بۆ ئەم بابەتە گەورەو مەترسیدارە، خولانەوەی مانگ و هاتووچوونی ئەستێرە گەڕۆکەکان بێو..

لافی ئەوەش لێبدەن کە بەمجۆرە وتارە بەڵگەکەمان گەیشتۆتە ئەوپەڕی سنوری کامڵی..

مانای وایە هانیان دەدەین وا باوەڕبکەن کە ئایینەکەمان پشت بە بڕێك بەڵگەی لاواز دەبەستێ".

لە لایەکی دیکەوە لەسەر هەقە چونکە ئەگەر ئێمە داوا لە خەڵکی بکەین کە بێن و گفتوگۆ لەسەر خودا بکەن ئەوا خۆیان لە هەندێ دڵنیابوون دوورەپەرێز ناگرن. باوەڕبوون بە بوونی خودا مانای گوێڕانەگرتنە بۆ پاڵپێوەنەرەکانی گومان، مانای باوەڕبوونە بە شتێکی نادیاری داخراو. "تەماشای هەر لایەك دەکەم تەنها هەر تاریکیو نوتەکی دەبینم، هەرچی شتێ کە لە سروشتدا هەیە جێی گومان و مایەی نائارامیە. ئەگەر من هیچ شتێکم نەبینیایە کە بەڵگەبێ بۆ بوونی خودا ئەوا لەسەر نکوڵیکردن سوردەبووم. ئەگەر لە هەموو جێیەکیش بەڵگەیەکم لەسەر بوونی خودا ببینیایە ملم دەدا بۆ ئیمان. بەڵان من لە حاڵێکدام کە شایانی بەزەیی





پیاداهاتنەوەیە چونکە زۆر لەوە زیاتر دەبینم کە بواری نکوڵیکردن بدات و کەمتر لەوەش کە بواری دڵنیایی ببەخشێ". ئەگەر لەمەیش زیاتر دوور بکەوینەوە ئەوکاتە دەبێ بە ناچاری دان بەم مەسەلەیەدا بنێین: "ئەگەر خودایەك بوونی هەبێ، ئەقڵەکان ناتوانن دەرکی پێ بکەن چونکە بێ کەرت و بێ سنورەو، هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ ئێمەدا نیە. کەواتە ئێمە ناتوانین کە بزانین چیەو، کە ئایا بوونی هەیە یان نا".

پەکوو لەم ڕێگا سەیرو سەمەرە کە ئەقڵانیەکانی ڕێبازی خوداخوازی دەیگرنەبەر! ئەمێستا ئەگەر ئێمە بمانەوێ بنەمای ئایین توندوتۆڵ بکەین و قەناعەت بە کافرەکان بهێنین و ڕێسای ئەخلاقێکی تۆکمە دابڕێژین، پێویستە خۆمان لە زمانی ئەوان بەدووربگرین و بە زمانێکی دیکە بدوێین.

بەڵام بە چ زمانێك؟ ئەگەر ئێمە لەوە بەئاگابین کەلە کتێبی (پۆلێنکاریە فەلسەفیەکان) و لەسەرنجەکانی کتێبی (ستایشی مەسیحیەت)ی پاسکال دا هاتوون، یەکڕاست دەرك بەو زمانە دەکەین. شایانی باسە ئەو سەرنجانە لە دوای مردنی پاسکال لەژێر ناونیشانی (ئەندێشە)دا بلاوکرانەوە.





## بەشی دووەم

## شێوازەکانی لێکۆڵینەوە

ئەگەر لەو هەوڵانەی مرۆڤ وردبینەوە کە بۆ چەسپاندنی بناغەی زانینەکانی خۆیان داویانە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەسێ جۆر لە هەوڵ لە ئارادا هەن بەم شێوەیە: ئامانجی هەندێ لەو هەوڵانە سەلماندنی هەندێ ڕاستیە بە شێوەیەکی پێشوەختانە، ئامانجی هەندێکی تریان چەسپاندن و دڵنیابوونە لە هزرەکانی نێومێشك لە ڕێگای تاقیکردنەوەوە بە شێوەیەکی درێژخایان، دواجار هەندێکیشیان ڕێنومایی بەم بیرۆکەیە دەکەن: چەند سەرچاوەیەك هەن بە بەڵگە دادەنرێن و پێویستە باوەڕیان پێ بکرێت. لە ڕاستیدا سێ سەرچاوە هەن کە پێویستە کەڵکیان لێوەربگیرێت، بەڵام هەمان بەهاو نرخیان نیەو نابێ بە هەمان شێوە بەکاربهێنرێن.





**له ماتماتیك دا**

لەم مەیدانەدا تاقیکردنەوەو بەلگە وەك یەك بێ سـودن. چونکـە مەسـەلە ماتماتیکیـەکان کۆمـەڵێك ڕاسـتیی ڕووتـن کـە گەوهـەرو یاسـای خۆیـان هەیـە. تەنـها لـە ڕێگـای مشتومڕیشـەوە دەتوانـین تایبەتمەندیـەکانیان دەسـت نیشـان بکـەین، بـەڵام بـۆ ئەم دەست نیشانکردنە پێویستە بە دانانی کۆمـەڵێك پێناسـەو پرەنسـیپ و بەڵگەنەویسـت دەسـت پـێ بکـەین. لـە دوای ئـەم مشـورخواردنەش هیـچ شـتێك هێندەی سەلماندنی ڕستێك لە مەسەلە ئاسانتر نیە.

لـە ڕاسـتیدا وەکـی پاسـکال دەڵـی لـەم مەیدانـەدا نموونەی باڵا ئەوەیە کە پێناسەی هەموو چەمکـەکان بکەین و گشت مەسەلەکانیش بچەسپێنین. بەڵام ئەم نموونە باڵایە قابیلی بەرجەسـتە بـوون نیـە، چونکـە لە ڕاستیدا ئێمە شتێك بە هۆی شتێکی ترەوەو شـتی دووەمیـش بـە هـۆی سـێیەم و سـێیەمیش بـە هـۆی چوارەمـەوە پێناسـە دەکـەین. هەڵبەتـە لـە پێناسەیەکیشەوە بۆ یـەکێکی دی دەگەینـە سـنورێکی سەرەتایی کـە نـاتوانرێ بگەڕێنرێتـەوە بـۆ سـنورێکی سـادەتر، کەواتـە قـابیلی پێناسـەکردن نیـە. هـەروەها





ناشـــتوانرێ هـــەموو مەســـەلەکان بســـەلمێنرێ. مەسـەلەکان سـەلماندن قبـولْ دەکـەن مادامـەکی ئێمـە دەتوانـین ئـەوە بچەسـپێنین کـە بـۆ ئـەوەی بتوانـرێ پێشـنیار بکـرێ پێویسـتە پێشـنیاری مەسـەلەیەکی ئێجگار سادەتر و زۆر ئاشکراتر بکرێت، یـاخود دەبـێ پێناسـەیەك پێشـنیار بکرێـت کـە ڕێککـەوتن هـەبێ لەسـەری. هـــەر بۆیـــە دیســـان لێرەشـــدا نـــاتوانین بێ سنور بڕۆین.

کەواتـە شـێوزاە نموونەییەکـە، واتـە شـێوازی: (پێناسەکردنی هەموو شـتێك و چەسـپاندنی هـەموو شتێك) لە توانای ئێمەدا نیـە. بـەڵام خـۆ ئێمـە لانـی کەم دەتوانین هەموو ئـەو شـتانە پێناسـە بکـەین کـە دەتوانرێ پێناسە بکرێـن، واتـە هـەموو ئـەو شـتانەی کە ئێجگار زۆر سادە نین، هەروەها هەموو ئەو شتانە بسەلمێنین کە دەتوانرێ بسەلمێنرێن، واتە هەموو ئەو شـتانەی کـە دەتوانـرێ بگەڕێنرێنـەوە بـۆ کۆمـەڵێك توخمی سادەتر، بەڵی دەبێ لە ماتمـاتیکدا بـەو جـۆرە بکـرێ. مادامـەکی کـە هـەر لـە سەرەتاشـەوە مشـوری خۆمـانی بـۆ دەخۆیـن، کەواتـە تیـایدا سـەرکەوتوو





دەبین. پاسکال ئەو مشورخواردنە لە سێ گروپە ڕێسادا کورت دەکاتەوە بەمجۆرە:

**أ-ڕێسا بۆ پێناسەکان:**

1-نابێ پێناسەی هیچ شتێك لە شتە زانراوەکان بکەین بە ئەندازەیەك کە هەرگیز دەستەواژەی ڕۆشنترمان لەلا نەمێنێ بۆ ڕاڤەکردن.

2 -نابێ هیچ دەستەواژەیەك لە دەستەواژە ناڕۆشن یاخود دردۆنگەکان بێ پێناسەکردن جێ بهێڵین.

3-دەبێ لە پێناسەکردنی دەستەواژەکاندا وشەی تەواو ناسراو یاخود پێشوەخت ڕاڤەکراو بەکاربهێنین.

**ب-ڕێسا بۆ پرەنسیپەکان:**

1-نابێ هیچ پرەنسیپێك لە پرەنسیپە پێویستەکان، ئیدی هەرچەندێك ڕۆشن و بەڵگەنەویستیش بن، بەبێ پرسیارکردن لەوەی کە ئایا قبوڵی بکەین یان نا جێبهێڵین.

2-پێویستە تەنها شتە تەواو بەڵگەنەویستەکان بکەین بە پرەنسیپ.





**ج-ڕێسا بۆ بەڵگەکان:**

1-نابێ بەلگە بۆ هیچ شتێك لە شتە بەلگەنەویستەکان بهێنینەوە بە ئەندازەیەك کە هیچی لەوە ڕۆشنترمان لەلا نەمێنێ بۆ سەلماندن.

2-پێویستە هەموو مەسەلە ناڕۆشنەکان بسەلمێنرێ، دەبێ لە بەلگە بۆ هێنانەوەو سەلماندنیشیدا تەنها پرەنسیپی بەلگەنەویست یاخود ئەو پرەنسیپانە بەکاربهێنین کە لەوەپێش پەسەندکرابن یاخود سەلمێنرابن.

3-پێویستە لە ڕووی ئەقلیەوە شتە زانراوەکان بگۆڕین بە پێناسەکراو، بۆ ئەوەی بەهۆی دردۆنگی دەستەواژەکانەوە کە پێناسەکان بەرتەسکیان کردوونەتەوە نەکەوینە هەڵەوە.

ئەمانە ئەو ڕێسایانەن کە پەرنسیپی بەلگە تۆکمەو چەسپاوەکان دەگرێتە خۆ".

**لە فیزیك دا**

لە ڕاستیدا، تاقیکردنەوە ئەو ڕووداوانەمان پێشکەش دەکات کە پێویستە فیزیك زانین و ڕاڤەکردنی بکات بە ئامانجی خۆی. هەروەها ئەگەر





بمانەوێ لە بەهای ئەو گریمانانە دڵنیابین کە کردوومانن، دیسان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ تاقیکردنەوە. هەر لێکۆڵینەوەیەك لە دەرەوەی بازنەی تاقیکردنەوەدا جۆرێکە لە شێتیی. کاتێك کە کەسێکی وەکی دیکارت لافی ئەوە لێدەدات کە یاساکانی جوڵە (قوانین الحرکة) لە سیفاتەکانی خوداوە دەردێنێ، هەڵەیەکی میتۆدییانەی هێندە زەق دەدات کە لێبوردنی بۆ نیە. "نهێنیەکانی سروشت شاراوەن. ئەگەرچی سروشت هەمیشە کاریگەری بەردەوامی خۆی دادەنێ، بەڵام ئەوە ئێمە نین کە هەمیشە کاریگەریەکانی کەشف دەکەین. ئەوە زەمەنە کە لە سەردەمێکەوە بۆ یەکێکی تر کاریگەریەکانی کەشف دەکات، هەرچی ئەو تاقیکردنەوانەیشە کە بواری تێگەیشتن لە سروشتمان دەداتێ، بە بەردەوامی زیاد دەکەن. لەبەرئەوەی کە ئەم پرەنسیپانەش تاقە پرەنسیپی فیزیکن هەربۆیە بە زیادبوونی ئەوان دەرەنجامەکانیش زیاد دەکەن".

پاسکال بە تیۆرەی تاقیکردنەوە دەست پێناکات، بەڵکو کارێکی لەمە باشتر دەکات، خۆی ڕۆڵی زانای فیزیك دەگێڕێ. هەمووان گریمانەکانی تایبەت بە





قورسایی هەوا، ڤین لە بۆشایی و، لولە (أنبوب)ی تورشیلی دەزانین. خودی پاسکال خۆی، کە ڕەنگە بە کاریگەری دیکارتیش بووبێ، تاقیکردنەوەی بورجی (سان جاك)ی داهێناو جێبەجێشی کرد، هەر پاسکالیش بوو کە داوای لە (بیرێ) کرد تاقیکردنەوە بەناوبانگەکەی (بوی دی دوم) جێبەجێ بکات و، هەموو ئەو کارانەیشی بۆ بەیانکرد کە پێویستە لە پێناو سەرکەوتنی تاقیکردنەوەکەیدا بیکات.

ئەگەر (ئوزو) داهێنەری تاقیکردنەوەی (بۆشایی لە بۆشایی)دا بێ کە مەسەلەیەکی مێژوویی ناڕۆشنە ئەوا بە دڵنیاییەوە پاسکال بەشداری تیادا کردو ئەنجامەیەکلاکەرەوەکانیشی لە تاقیکردنەوەکانی (ڕوان)ەوە دەرهێنا. ئەمانە هەمووی تیۆرەی هاوسەنگی شلەکان و تیۆرەی قورسایی هەوای لێکەوتەوە. ئیدی بۆ یەکەمجار لە مێژوودا بینیمان کە ماتماتیك و فیزیك پێکەوە یەکدەگرن تاوەکو تێڕوانینێکمان سەبارەت بە یاساکان و ڕەوتی سروشت پێشکەش بکەن.





**له لاهوت دا**

ئەگەر ماتماتیك تەنها پشت لە مشتومڕ ببەستێ بە شـێوەیەكی پێشـوەختانەو، فـیزیكیش تەنـها بـە تاقیكردنـەوە، ئـەوا مەسـەلەگەلێك هـەن كـە پشـت بـە سـەرچاوە بەڵگـە (المرجـع الحجـە) دەبەسـتن. "ئەگـەر بمانەوێ بزانین كێ یەكەمین پادشای فەرەنسیەكان بوو، جوگرافیاناسەكان بازنەی نیوەی ڕۆژ Meridien لە كوێدا دادەنێـن، ئـەو وشـانە چـین كـە لـە زمـانێكی مـردوودا بەكاردەهێنرێن و، هەموو شـتە هاوشـێوەكانی تـر، جگە لـە كتێـب چ ئـامرازێك وەڵامـی ئـەم پرسـیارانەمان دەداتـەوە؟ كـێ دەتوانـێ شـتێكی نـوێ سـەرباری زانیاریەكانی ئەم كتێبە بكات كە ئێمە تەنهاو تەنها بـە زانیاریەكانی نێوی بەس بكەین؟ تەنها سـەرچاوە بەڵگە دەتوانێ شتەكانمان بۆ ڕۆشن بكاتـەوە". ئەگـەر كەسێك وەك شـاهیدێك شـتێكی بـۆ هێنـاین و ئـەو كەسـە جێـی متمانـە بـوو، هـەر ئـەوەندە بەسـە تـاوەكو لـەم جـۆرە بابەتانـەدا قەناعـەت بكـەین. ئەگـەر سـەرچاوە بەڵگەش نەما ئەوا دەبێ بێدەنگی لێبكەین.

كوتومت ئـەوەی كـە لـە لاهـوت دا ڕوودەدات هـەر ئەمەیە. ئایا ڕاستە كـە خـودا لـەلای شـاخی سـینا بـۆ





موسا دەركەوت؟ ئايا ڕاستە كە مەسيح دەستكردی موعجيزەيە؟ ئايا ڕاستە كە لە خاچ درا؟ خودا بە سروش چی نارد بۆ موسا؟ مژدەی چیدا بە مەسيح؟ بەبێ سەرچاوە بەڵگە ئەم مەسەلانە چۆن بزانين؟ "لە كايەی لاهوت دا سەرچاوە بەڵگە هێزی خۆی دەبينێ، چونكە لەم كايەيەدا پێويستيەكە بۆ هەقيقەت و، هەقيقەت بە هۆی ئەوەوە دەزانرێ، بۆ خستنەگەڕی دڵنيايی تەواويش سەبارەت بەو شتانەی كە بەلای ئەقڵەوە گرانن، هێندە بەسە كە لە كتێبە پيرۆزەكاندا پێشچاوی بخەين".

بەم پێيە دەتوانين وەڵامی ئەم پرسيارە گرنگانە بدەينەوە: باوەڕ بە كاميان بكەين؟ دێرينەكان يان نوێيەكان؟ هەرچی سەبارەت بەو شتانەی كە پشت بە مشتومڕو تاقيكردنەوە دەبەستن، بێگومان بڕوا بە تازەكان دەكەين چونكە لە دێرينەكان زياتر دەزانن و كەڵك لە لێكۆڵينەوەكانيشيان وەردەگرن. لەم ڕووەوە مرۆڤايەتی لە تاقە مرۆڤێك دەچێت كە هەميشە دەژی و بەردەوام فێردەبێ. دێرينەكان لە ڕاستيدا وەك لاو وابوون. گوناهی ئەوان لەوەدا نيە كە بەهۆی كەميی بەڵگەوە بە هەڵەدا چوون، ئەگەر





تەمەنی زیاتریان بۆ بنووسرابایەو هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بژیابان یەکەمین کەس دەبوون کە شتێکی جیاوازیان دەووت لەوەی کە لە ڕابوردوودا وتیان.

بەڵام لە مەیدانی لاهوت دا بارودۆخەکە جیاوازە. چونکە ئەو کەسانەی کە لە ڕووداوە گێڕدراوەکانەوە نزیکتر بوون، واتە شاهید عەیانەکان و ئەوانەی کە خێرا کە قسەکەیانی لە دەم گرتونەتەوە، پێویستە لە خەڵکانی تر زیاتر متمانەیان پێ بکرێت. لێرەدا تەنهاو تەنها سەرچاوە بەڵگە بەهەند وەردەگیرێ و ڕەچاو دەکرێ. پاسکال سەرزەنشتی هەڵوێستی ئەو کەسانە دەکات کە بە بیانووی سوننەتەوە بەرهەڵستی پێشکەوتنی زانستەکان دەکەن، هەروەها سەرکۆنەی هەڵوێستی ئەو کەسانەش دەکات کە بە بەڵگەی پێشکەوتنی زانستەکان بیروڕای نوێ دەهێننە نێو مەیدانی لاهوتەوە، پاسکال دەستەی یەکەم بە نابیناو دووەمیشیان بە ساختەچی و فێڵباز ناودەبات.

کەواتە با ئەرکی خۆمان لەهەر لقێك لە لقەکاندا بزانین و جێبەجێی بکەین بەم جۆرە: مشتومڕی پێشوەختانە لە ماتماتیك دا، تاقیکردنەوە لە فیزیك دا، متمانەکردن بە سەرچاوە بەڵگە لە لاهوت دا.





## بەشی سێیەم
## گومڕایی و ڕێگاکانی

### 1-ئیماندارن و گومڕاکان

ئـەو کەسـانەی کـە بـە هـۆی لـە دایـك بـوون و پەروەردەکەیانـەوە دڵیـان بـە ئیمـان کراوەتـەوە دەسـبەجێ دەزانـن ئـەو سـەرچاوە بەڵگانـە چین کـە پێویستە باوەڕیان پێبکرێت و، بـەم پێیـە ئـەو ڕێسا ئـەخلاقی و ڕۆشـنبیریانەش چین کـە دەبێ بخرێنـە بـواری جێبەجێکردنـەوە. ئـەو کەسـانە بـە هـۆی: (پاساوەکانی دڵ کە ئـەقڵ لێی بێئاگایـە) ئـەو شـتانە دەزانـن، بـەهۆی ئـەو غەریزەیـەوە، کـە لـە حاڵـەتی ئیمـاندا، وامـان لێدەکـات بـەو پرەنسـیپانە ئاشـنابین کەلـە دواییـدا ئـەقڵ دەرەنجامـەکانی لێـوە دەردێنـێ. ئێمە جگە لە پێکەنین بە حاڵی ئەو چەشنە کەسـانە هیچ چارێکی ترمان نیە.

"چونکە دڵ هەست بە خودا دەکات نـەك ئـەقڵ"
ئـای لـە بەختـەوەریی ئـەو کەسـەی کـە بـەم شـێوەیە هەستی پێدەکات!





بەڵام لە تەنیشت ئەو پیاوچاکانەشدا تاقمێکی تر هەیە کە دەکرێ بە دوو بەشەوە:

یەکەم، بێدەربەستەکان: کە گوێ بە ئاراستەکردنی ژیانی خۆیان نادەن و بە درێژایی رێگا لەم مەسەلەیە دوور دەکەونەوە.

دووەم، بێئیمانەکان: کە پێداگری لەسەر بێ ئیمانی خۆیان دەکەن و، تەنانەت جاروبار لافیشی پێوە لێدەدەن. ئەمێستا ئێمە چی بە هەریەکێك لەم دوو تاقمە بڵێین؟

تاقمی یەکەم تەنها بیر لە یەك شت دەکەنەوە کە ئەویش: گەمەکردن و ڕابواردنە. ڕەوشی مرۆیی ئێجگار ترسناکە بە هۆی ئەو گومانانەوە کە دەوری بنچینەی دروستبوون و چارەنووسمان و ئەو ڕێچکەیەی داوە کە پێویستە بیگرینە بەر، هەرکەسێك کە لەم ڕەوشە ڕابمێنێ ناتوانێ ڕێگای گێژبوون لە خۆی بگرێو ئارەزووی بەردەوام بوونی بۆ ژیان نامێنێ، هەر بۆیە زۆربەی ئەو کەسانەی کە هێزو ئازایەتی بیرکردنەوەیان نیە پەنا دەبەنە بەر گەمەکردن، یاری بە کاغەز دەکەن یاخود گەمەی بلیارد دەکەن یان تۆپ بۆ یەکتری هەڵدەدەن. ئەم خۆخافڵاندنەش مردن و تراژیدیای بوونیان و





تەنانەت تازەترین و سەختترین خەم و پەژارەکانیان لەبیر دەباتەوە. "بەمجۆرە ژیان تێدەپەڕێ. مرۆ لە ڕێگای بەگژداچوونەوەی هەندێ کۆسپ و تەگەرەوە بە دوای دڵنیاییدا دەگەڕێ، ئیدی هەرکە بەزی حەوانەوە باری سەرشانی قورس و گران دەکات. چونکە ئەوجا بیرکردنەوەی یان دەڕوات بەلای ئەو بەلایانەدا کە لە ژیاندا هەن، یاخود بەرەو تەنگانەکانی کە هەڕەشەی لێدەکەن. کاتێك کە خۆی لەنێو دڵنیایی تەواودا دەبینێتەوە ئینجا بێزاری بە خۆی و دەسە لاتە تایبەتەکەیەوە لەنێو قولایی دڵەوە کەڕەگوڕیشە سروشتیەکانی لەوێدایە، هەڵدەقوڵێ و بیر بە ژەهرەکانی خۆی لێوان لێو دەکات".

پاسکال بە توندی ئەو جۆرە کەسانە ئاگاداردەکاتەوە. "ئەو کەسانەی کە بێ ئەوەی بیر لە ژیانی دوایی (الحیاه الأخیرة) بکەنەوە ژیان بەسەردەبەن، ئەوانەی کە تەنها لەبەرئەوەی لەنێو خۆیاندا ڕاڤەی قەناعەتپێکەر بەدی دەکەن گەڕان و لێکۆڵینەوە فەراموش دەکەن، ئەوەیان لەبیردەچێ کە نەمریی ڕۆح یەکێکە لەو بیروڕایانەی کە خەڵکی بە متمانەیەکی ساویلکانە پەسەندی دەکەن، یاخود لەو





بیروراپیانـەی کـە ســەرەڕای نارۆشـنییان، بنـەڕەتێکی چەسـپاویان هەیـە، هـەرچی ئـەو کەسـانەیە مـن تەماشایەکی تەواو جیاواز تەماشایان دەکەم. چونکە پشـتگوێ خسـتن لـەم چەشـنە مەسـەلە گرنگـە وابەسـتەیە بـە خۆیـان و بـە نـەمریی و بـە قەوارەیانـەوە پـتر لـەوەی سەرسـامم بکـات تورەم دەکات".

هـەرچی بـێ ئیمانەکانیشە پاسـكال قسـەگەلێکی تریان ئاراستە دەکات.

ئەوانـە بەڵگـەی ئـەو کەسـانە دەهێننـەوە کـە موعجیزەکانی رابوردوویـان گێڕایـەوەو دەڵێـن: چۆن بـاوەڕ بـەو بـەناو شـاهیدانە بکـەین کـە دوورتریـن شتمان لە باوەڕکردنەوە بۆ دەگێڕنەوە، لـە نموونـەی: راوەسـتانی خـۆر، گۆڕانـی ئـاو بـۆ مـەی، ژیانـەوەی مردوو؟ بەڵکە ئەوانـە زۆر لەمـە دوورتریـش دەڕۆن: چونکـە نکوڵـی لـە بوونـی خودایـەکی چاکـەخوازو رۆحێکـی نـەمرو رێسایەکی رەها بـۆ دادپـەروەری و چاکـەخوازی دەکـەن. ئەگـەر دروسـت خـودا چاکەخوازبێ راڤەمانچی دەبێ بۆ ئەو خراپەیەی کە لـە جیـهاندا هەیـە؟ وێنامـان چۆنـە بـۆ پاراسـتنی





یادەوەری ژیان لە دوای مردن؟ چۆن تێبینی ئەوە ناکەین کە ئەوەی لێرە هەقە لەوێناهەقە؟

بەچی وەڵامی ئەو کەسانە بدەینەوە؟

مۆنتانی لە کتێبی Apologie de Raymond de Sebonde دا دەڵێت: "ئەوەی کە بێئیمان دەکاتە بێئیمان فیزی زل و، متانەبوونی ڕەهایەتی بە ئامرازەکانی پرسیارکردن و سەلماندن کە بەکاریاندێنێ، لوت بەرزیە بێ ئابڕووانەکەیەتی. کەواتە ئەم لوت بەرزیە چ بەهایەکی هەیە؟ ئایا بە تەنها تێنەگەیشتن لە بوونی خوداو نەمریی ڕۆح و خوڵقێنراویی جیهان بەسە بۆ ئەوەی کە ئێمە مافی حوکمدانمان هەبێت لەسەر ئەوەی کە خودا بوونی نیەو ڕۆح لەناودەچێ و دونیاش نەخوڵقێنراوە؟".

سە بارەت بەم مەسەلەیە مۆنتانی دوا قسەی خۆی کرد. هەر ئەوەندە بەسە کە ئێمە بگەڕێینەوە سەر ئەو دارشتانەی کە ئەو کەشفی کرد. پاسکال جگە لە دووپاتکردنەوەی ئەو دارشتانە هیچی تر ناکات. بەڵام لە کاتێکدا کە مۆنتانی شەبەنگی زەردەخەنەیەك دەهێڵێتەوە، پاسکال ئاگری لێ دەپژێ.





**2-ڕەخنەی هەستەکان و ئەقڵ**

کەواتــە ئــەو هەســتە کەشــف کــەرە ســەیرو ســەمەرانە چــین؟ ئــەو زانســتە ســەیرە چیــە کــە بێئیمانەکان پشتی پێ دەبەستن؟

**هەستەکانیان؟**

مۆنتــانی لــەدوای گومانخوازەکــانی ســەرەتا، ڕەخنەی لە هەستەکان گرتووەو دەڵێ:

"بە هۆی دیــاردە درۆزنەکانــەوە ئــەقڵ لــە خشتە دەبات". ئایا هەمیشە دژایەتی یەکتر ناکەن؟ ئایا بـە هــۆی خــەون و خــەیاڵ و وەهمــی بەردەوامــەوە چەواشەمان ناکات؟

**یاخود مشتومڕەکانیان؟**

کـە دەتوانـین بـە ئـارەزووی خۆمـان چیمـان بـوێ لێـی هـەڵێنجین. "ئـەقڵ گوێڕایەڵـە دەشـێ مـەیل بـە هـەموو لایـەکدا بکـات". هەربۆیـە هـەموو شـتێك بـە هەڵەیدا دەبات. ئەندێشەو ئەو چەواشـەکاریانەی کـە بــە دوایــدا دێــت، خۆشویســتنی کەســانی دیو قــین لێبوونیان، بەرژەوەندی، نەخۆشی، بەهەڵەیدا دەبەن.





دەردێکـــەو دەرمـــانی نیـــە. بـــۆ دڵنیـــابوون لـــە مشتومڕەکەیشمان دەبـێ نیشـانەیەکی دوور لـە هەڵە (معصوم) مان پێ بێـت کـە بەڵگـە بێـت بـۆ ڕاسـتیی. بـــەڵام بـــۆ کەشـــفکردنی ئـــەم نیشـــانەیە دەبـــێ لە پێشدا بیزانین.

**یان بەڵگە نەویستیی؟**

بـــەڵام ئەگـــەر ئێمـــە بیرۆکەیـــەکمان بـــە بەلگەنەویسـت بێتـە پێشـچاو ئەمـە هۆکـارێکی بـەس نیـە بـۆ ئـەوەی کـە بەهایـەکی ڕاسـتەقینەی ڕەهـای هـەبێ. بـەم پێیـە، مەسـەلەی بەلگەنەویسـت بـە گۆڕانی کات و شوێن دەگۆڕێ. "ئەوەی کە لـە بـەردەم چیای پیرینێدا هەقە لـە پشـتەوەیدا ناهەقـە، پـەکوو لـەو دادپەروەریـە کـە ئاراسـتەی ڕووبـار بـەری پـێ دەگـرێ!". دەوتـرێ: "بنەماگـەلێکی سروشـتی هـەن خۆیان بەسەر ئـەقڵی ئێمـەدا دەسـەپێنن، دەبێ بـەو جـۆرە تەماشـایان بکـەن کـە شـیاوی نکوڵـی لێکـردن نـین". بـەڵام ئایـا ڕێـی تێناچـێ کـە ئـەم پرەنسـیپانە تەنـها گوزارشـتێك بـن لـە خووەکۆنـەکانمان؟ "ئایـا بنـەما سروشـتیەکانمان هـەمان بنـەما باوەکانمـان نـین؟" "زۆر دەترسـێم کـە ئـەم سروشـتەش هـەمان





خـــــووی ســـــەرەتابیَ، وەك چـــــۆن خـــــوو سروشتی دووەمە".

سەبارەت بەو زانستەیش کە بیَئیمانـەکان پشـتی پیَدەبەستن، با دیسان بگەڕێینـەوە بـۆ لای مۆنتـانی. پاسکال لە گفتوگۆیدا لەگـەڵ هێـژا دی ساسـیدا بـاس لـە سـەلماندنە سەرسـوڕهێنەرەکەی مۆنتـانی دەکـات. چونکـە ئێمـە نـازانین ڕۆح و جەســتەو مـادە چیـە. ناشزانین لە چ کاتێکدا ڕۆح دەستی بە بوون کردو کە ئایا کۆتایی هەیە یان نا. نازانین کەی ڕۆح بە هەڵدا دەچیَو لە چ کاتێکدا ڕاستی دەپێکیَ. نازانین کە ئایـا زیندەوەرەکـان بیردەکەنـەوە یـان نـا، نــازانین کـات و شـــوێن و جوڵـــەو یـــەکبوون چیـــە، نــــازانین: "تەندروسـتی و نەخۆشـی، ژیـان و مـردن، چاکـەو خراپـە، چاکـەخوازی و گونـاە" چـین، ئەندازەکـەمان پرەنسـیپەکانی شـلۆقە، فـیزیك و پزیشـکی و مێـژوو سیاسـەت و زانسـتی ئـەخلاق و ئیجتیـهاد، هیـچ شـتیَ جێـی متمانــە نیــە. پــەکوو لــەم پاسـاوەی فیزی بیَئیمان!

مۆنتـانی لەسـەر هەقـە کـاتێك کـە: (بـە تونـدی ئەقڵی بەتالٓ لە ئیمان ئاگاداردەکاتەوە) (تەنانـەت لـە بەرزاییەکانیەوەی دادەگریَو لەگەڵ ئاژەڵدا بەراوردی





دەکات). پاسکال بەم وتەیە دوا گورزی خۆی ئاراستە دەکات کە دەڵێ: "ناتوانم خۆشنوود نەبم وەختێك کە دەبینم لەلای ئەم دانەرە، ئەقڵی لەخۆبایی بە هەمان چەکی خۆی سوکایەتی پێدەکرێت".

دروست "گومانکردن ڕاستترە". فیزی بێئیمانیش چیدی نیە جگە لە گەوجیەك کە بەرەو تاوانی دەبات. پەکوو لەو فیزە ئابڕووبەرەو لەو ساویلکەییە کە شایانی زەم کردنە! "ئەگەر سەرەتا مرۆڤ لە خۆیەوە دەست پێبکات، ئەندازەی بێتوانایی خۆی بۆ دەردەکەوێ لە تێپەڕاندنی ئەو سنورەدا کە بۆی دیاری کراوە. بەش چۆن دەتوانێ کە گشت بزانێ؟ ڕەنگە خواستی بەش لانی کەم زانینی ئەو بەشانە بێ کەلەگەڵیدا دەگونجێن؟ بەڵام بەشەکانی جیهان بە جۆرێك وابەستەن بە یەکدییەوە کە پێم وابێ ئەستەمە بتوانین بەشێك بەبێ یەکێکی دی و بەبێ گشت بزانین".





## بەشی چوارەم
## گرەوو ئیمان

### کەواتە چی بکەین؟

گومـانکردنی مۆنتــانی، بێئیمــانی تێکدەشــکێنێ بەڵام بە تێکشکاندنی بـەهای ئـەقڵ. ئایـا لـە هـەمان کاتدا هەموو ئومێدێکیشمان بە بوونی ژیانێك کە بـە شـێوەیەکی ژیرانـە ڕێکخرابــێ تێکناشــکێنێ؟ ئەگــەر ئەقڵ بێ توانابێ لە دژی ئایین، ئایا بێتوانــایش نابـێ لە خزمەتکردنی ئایین؟

ئەمێســتا ئێمــە ئــەوەتاین لــەنێو جەرگــەی کێشـەکەدا. پاسـكال لـە ڕێگـای کێشـکردنی سـەرنجی کەســی بێئیمــان بــەرەو ئــەو شــتەی کــە لــە کــاتی گرەوکردنــــدا بـــە هەڵســـوکەوتێکی دانایانـــــە تەماشادەکرێ، خۆی لە کێشەکە دەدزێتەوە.

کەسی گرەوکـەر خـۆی لەبـەردەم دوو هەڵوێستدا دەبینێتەوە. ئەگەر لە هەردوو لایەنەکەدا ئەگـەرێکی چوون یەك لە بردنەوە (الربح) و دۆڕاندن (الخسارة) بــەدی بکــات، هیــچ چــارێکی تــری نامێنــێ تەنــها





وازهێنـان لـه گهمــهکردن یـاخود پشـت بهسـتن بـه فاکتـهری ڕێکــهوت نـهبێ. ئهگـهر یـهك ئهگـهر بـۆ بردنهوه ههبێو له  لایـهکی تـر دوو ئهگـهر لـه ئـارادا هـهبێ، دهبـێ لـهو شـوێنهدا گرهوبکـات کـه ئهگـهری بردنهوه زیاتره، وه ئهگهر ئهگهری بردنهوه به تهنها له یهکێك لهم دوو لایهنهدا زۆربێ، بێئهقڵیـه ئهگـهر ئهو لایهنه ههڵنهبژێرین.

ڕهوشی مرۆییش به ههمان شێوهیه.

ڕێکخسـتنی ژیانمـان بـه گوێـرهی بــاوهڕبوون و باوهڕنــهبوونمان بــه بوونــی خــوداو نــهمریی ڕۆح و ڕێساکانی ئهخلاقی  مهسـیحیی دهگۆڕێ. بـهڵام ئێمـه ناتوانین هیچ کامیان  بچهسـپێنین. کهواتـه دانـایی وا دهخوازێ که لهم چهشنه بابهتانهدا واز له ههر بڕواو حوکــم و کــارێك بــهێنرێت. بــهڵام ئــهم دهســت بهرداربوونـه ئهسـتهمه. چونکه ئێمـه ناچـارین کـه هـهڵبژێرین. دهبـێ بـهو جـۆره ڕهفتـار بکـهین وهك بڵێی ئـایین شـتێکی ڕاسـته یـان دهبـێ لـه دهرهوهی چوارچێوهکـــهیو لـــه دژی ههڵســـوکهوت بکـــهین. بمانهوێ یان نا دهبێ ههڵوێستێکیان وهربگرین.





بەڵام کام لایەنیان هەڵبژێرین؟ پێویستە وەکی کەسێك ڕەفتار بکەین کە گرەو دەکات. با بزانین کام لایەنیان کەمترین زەرەر و زیاترین قازانجمان بۆ مسۆگەر دەکات.

ئەگەر گرەوم لە دژی ئایین کرد چ قازانجێك دەکەم؟ چەند ساڵێك گەمەو ڕابواردن، پەکوو لەو گەمەیە! "دەسبەجێ نەخۆشی دەکەوێتە ویژەم".لە بەرامبەر ئەوەشدا بەختەوەری هەمیشەییو کامەرانی بێ پایان لە کیس خۆم دەدەم. ئەگەر گرەوم لەسەر ئایین کرد چ زەرەرێك دەکەم؟ هیچ. چونکە ژیانێکی پڕ لە شادومانی دڵنیایی و ڕاستگۆیی و چاکەخوازی و خواپەرستی دەژیم. دەشێ بەختەوەرییەکی جاویدانی و کامەرانیەکی بێپایانیشم دەستگیر بێت. وێڕای ئەوەش ئەگەر بە گرەوکردنم لەسەر ئایین بەهەڵەدا چووبووم، دوای ئەوەی کە دەمرم و لەنێودەچم هەست بە هەڵەکەی خۆم ناکەم، ئەم هەست نەکردنە وام لێدەکات کە داخ و حەسرەتی بۆ هەڵنەکێشم. بەڵام ئەگەر گرەوم لە دژی ئایین کردو لە هەڵبژاردنەکەمدا بەهەڵەدا چووم ئەوکاتە حوکمی حەسرەت و پەشیمانی هەمیشەیی بەسەرمدا دەدرێت.






**کەواتە دوودڵی بۆچیە؟**

کەواتـــە پێویســـتە گـــرەو لەســـەر ئـــایین بکرێـت.پێویسـتە مـرۆڤ وەك کەسـێکی ئیمـاندار هەڵسوکەوت بکات.

لـێرەدا کەسـی بێئیمـان دێتـە وەڵام و دەڵێـت: "نـاتوانم ئیمـان بێنـم". پاسـکال بـۆ ئەوکەسـە دوو وەڵامی لەلایە کە ئەمانەن:

وەڵامـی یەکـەم پشـت ئەسـتورە بـەم سـەرنجە گرنگە: "تۆ ئیماندار نیت و ناتەوێت ئیمانیش بێنی: کەواتە وەك کەسێکی ئیمـاندار ڕەفتـار بکـە. بچۆ بـۆ کۆنوێـژ (القـداس) و، ئـاوی پـیرۆز بخـۆرەوە"، وەك مۆنتانی دەڵێ: "دواجار دەبیت بە ئیماندار" چونکە مادامـەکی جوڵـەکانی خواپەرسـتی بـە ڕێکوپێکـی جێبەجێ دەکرێ، بەرەو ئیمانداریمان دەبات.

هاوکـات شـتێکی دیکـەش لـە ئـارادا هەیـە کـە ئەمەیـە: "ئـیرادە یەکێکە لە ئامرازە سـەرەکیەکانی ئیمـان، نـەك لەبەرئـەوەی کـە دەیخولقێنـێ بەڵکـە لەبەرئەوەی کە شتەکان بە گوێـرەی ئـەو تەماشـایەی ئێمە کە تەماشایان دەکەین ڕاستن یـاخود ناڕاسـتن". کەواتـە هێنـدە بەسـە کە بـە ویسـتێکی خۆڕاگرانـە





ئیمانمان بوویێت و، ڕۆشنایی بایەخمان بخەینە سەر هۆکارە پاڵپێوەنەرەکان و، لەو هۆکارانەی دووربخەینەوە کە مایەی گومانن، بۆ ئەوەی کە دواجار خۆمان سەرداری ئیمانی خۆمان بین.





## بەشی پێنجەم
## ڕاستیی ئاینی مەسیحی

ئـەم هۆكـارە لەهـەر شـتێكدا هەیــە كـە ڕاسـتیی ئاینی مەسیحی بسەلمێنێ.

پێویسـتنە ئێمــە گــرەو لەســەر ئــاین بكــەین و باوەڕمان بە بۆچوونەكانی هـەبێ. بـەڵام كـام ئـاین؟ پاسكال بێ هیچ دوودڵییێك دێتە وەڵام و دەڵێت: "ئەو ئاینەی كە پێویستە ئارەزووی گرتنی بكەین ئـاینیی مەسیحیە". لە ڕاستیدا دوو جـۆر لـەو بەڵگانـە هـەن كە ڕاستیی ئاینی مەسـیحی دەسـەلمێنن و قـایلبوونی ئێمـە لەسـەر بۆچـوون و سـوننەتەكانی دەسـەپێنن. هـەندێكیان تـەواو فەلسـەفیو، هەندەكـەی تریشـیان مێژوویی پەتییە.

### بەڵگە فەلسەفیەكان

پاسكال دەڵێ: "ئێمە بـەبێ مەسـیحیەت نـاتوانین هیچ شتێك لە مرۆڤ و لە بوون تێبگەین".

**كەواتە با یەكەمجار لە مرۆڤ ڕابمێنین.**





مرۆڤ بوونــەوەرێکی ئێجگـار سـەیرو نامۆیـە. لـە نێویـدا سـیفاتەکانی فریشـتەو ئـاژەڵ کۆدەبێتـەوە. مرۆڤ "چڵە قامیشە، لاوازترین شتە لە سروشت دا". بـەڵام "تایبەتمـەندی بیرکردنـەوە" یەکێکـە لـە خاسـیەتەکانی ئـەم قامیشـە. ئـەو غەریزەیـەی کـە هەیەتی وای لێدەکات و دەرك بەوە بکات کە خـاوەنی هـێزی فیکـریو، وزەگـەلێکی ئـەخلاقیو، ڕاچـەنین گەلێکی ئایینیە، ئەمانـەش ئەگـەر مانایـەکیان هـەبێ مانای ڕەوشێکی، ئەگەر ڕاستبێ بلێـین، خوداوەندیـە. بـەڵام ئـەزموون بـۆی دەرئـەخات کـە سـەرباری ئەوانـەش خـاوەنی لەشـێکی لـەناوچوو هـەڵچوونێکی تونـدو ئارەزووگـەلێکی نـەخۆش و نـەنگی گـەلێکی ناشـیرینە. توانـای بـاڵاترین هـزرو نزمـترین هەسـتی هەیە. کەواتە بوونـەوەرێکی دووفاقـە، مادامـەکی کـە دڵ و دەروونی بە ئیمان ئاوەدان نیە دەرك بـە خـۆی ناکات.

**با دووەمجار لە گەردوون ڕابمێنین.**

گەردوو نیش خاوەنی کۆمەڵە سیفاتێکی تەریب و هاوشـێوەیە. ئێمـە مـەزنی و جوانـی و قەشـەنگی و دەلالی لـە بێپایـانی گـەورەو بێپایـانی بچوکـدا بـەدی دەکەین. شانبەشانی ئەوەش هەرچی شتێ لە خراپەو





ئێش و ئـــازارو نەخۆشــی و بەدڕەوشــتی کــە بــاوەڕ دەکـــرێ و کـــە کۆمـــەڵێك دیمـــەنی بێئومێدکـــەری داخراون، تیایدا بەدی دەکەین.

کەواتــە چــۆن چۆنــی لــە ئاسـت خۆمــاندا ڕاڤــەی بوونــی ئــەم تێکەڵیــە جیــاوازە لــە ســیفاتی پێچەوانــە بکــەین؟ پاســکال بــاوەڕی وایــە کــە تێگەیشــتن لــەو تێکەڵیـە ئەسـتەمە ئەگـەر داوا لـە ئـایینی مەسـیحی نەکەین کە تاریکــاریی ڕێگامــان بــۆ ڕوونــاك بکاتــەوە، چونکە هەر ئەم ئایینەیە کە ڕاڤەی ئـەو مەتەڵـەمان بۆ دەکات، ئەگـەر ئـەویش نەبووایـە بێسـود بـەدوای هەڵهێنانیدا دەگـەڕاین. پوختـەی ئـەو ڕاڤەکردنــەش بەمجۆرەیە:

خودا لە سەرەتادا مرۆڤ و گەردوونی بە کامڵی و جوانــی دروســت کــرد. بــەڵام مــرۆڤ تــاوانی یەکــەمی کردو لە فەرمانی خودای خۆی یــاخی بــوو، ئیـدی لـە بەهەشت دەرکرا. ئەوە ڕاڤەی هەموو شتێکە.

ئەم مەسەلەیەش ڕاڤـەی ئـەوەمان بـۆ دەکات کـە لــەنێو ناخمــاندا فریشــتەو ئــاژەڵ هەیــە. فریشـــتە پاشماوەی بارودۆخی پێشوومانەو، ئاژەڵیش خـودا لـە ناخمـانیدا چـاند تـاوەکو لـە نـەوەکانیدا سـزای ئـادەم





بدات. مرۆڤ له پای ئەو تاوانەی کە کردی و وەك سزادانێك ئەوجا بووە ئەم بونەوەرە دووفاقەی ئێستا.

له لایەکی ترەوە بۆیە گەردوون ئەم ڕووخسارە بێئومێدکەرەمان پیشان دەدات چونکە: "خودا بە خواستی خۆی خۆی ون دەکات" وەك سزادانێك بۆ مرۆڤ. بەڵام لە دوای خۆی ڕووناکیەکی ئەوتۆی لە دونیادا بەجێهێشتووە کە هەڵبژێردراوەکان ڕێگای بەرپێی خۆیان ببینن و ڕزگاربوونیان دەستگیربێ، هاوکات تاریکاییەکی ئەوتۆیشی بە نێویدا پەخش کردوە کە گومڕاکان کوێربن و ڕێگای ڕاستیان لێهەڵە ببێ.

پاسکال نوسیویەو دەڵێ: "بەڵام من پێی لێدەنێم هەرکە ئاینی مەسیحی ئەو بنەمایە کەشف دەکات کە دەڵێ سروشتی مرۆڤ گەندەڵ و خراپەو لە بڵندییەکەیەوە دابەزیوەتە خوارەوە، دەسبەجێ وامان لێدەکات کە لە هەموو جێیەك نیشانەی ئەم ڕاستیە بە چاوی خۆمان ببینین".

ئەوکاتە دەرك بەوە دەکەین کە بۆچی خودا دەیویست ئێمە "کۆششێکی ئیرادی" بکەین تاوەکو بەرەو فەلسەفەی ڕایستەڤینە بچین. واتە





گرتنەبـەری "ڕێگـای نوچـدان و ملکـەچی" بەسـەر خۆماندا بسـەپێنین. ئـادەم بـە هـاندەری لـە خۆبـایی بوون ئەو کارەی کرد. ئـەو کەسـانەیش کـە تەنـها بـە دراو "معطیـات"ی هەسـت و بەڵگەنەویستی ئـەقڵ و بەهای مشتومڕەکانی خۆیـان نـەبێ نایانـەوێت بـاوەڕ بـە هیچی تـر بکـەن، لـە ڕاسـتیدا هـەر لەسـەر هێڵـە دیاریکراوەکـە دەمێننـەوە و شـایانی ئــەوە نـین کـە خودایان بۆ بەرجەستەبێ، هەر بۆیە تەنها دوودڵی و واق ورمانیان دەستگیر دەبێ. هەرچی دڵنیایی تیۆری و پراکتیکیشـە تەنـها تـەرخانی ئـەو کەسـانەیە کـە زانیان چۆن چۆنی خۆیان لـە ئـادەم بێبـەری دەکەن. ئـەوان ئـەو ڕۆژە خۆیـانی لێ بێبـەری دەکـەن کـە بـە کڕنووشـەوە ڕەفتـار دەکـەن، واتـە ڕۆژێك کـە خۆیـان لەسـەر ئیمـان هێنـان ناچاردەکـەن ئەگـەرچی ئـەو کارەیشـیان لەگـەڵ دراوی هەسـت و بەڵگەنەویسـتی ئەقڵیشـیاندا نەیەتـەوە. ئەوانـە خۆیـان ناچاردەکـەن لەسـەر باوەڕهێنـان بـە بـاوەڕی تـاوانی یەکـەم "الخطيئة الأولية "،ئەو باوەڕەی کە بەبێ ئەو لە هیچ شـتێك تێناگـەین و ئیمـان پـێ هێنانیشـی تەنـها بـە سەرکوت کردنی فیزو لەخۆبایی بوونمان دەبێـت. لـە





ڕاستیدا هیچ باوەڕێك هێندە بەلای ئەقڵەوە گران و، هێندە بەلای ڕۆحەوە مایەی شۆك و هێندە پێویستی بەم وازهێنانە فراوانە نیە لە هزری شەیتانیانە کە لە بەردەم ئیماندا لەنێو ڕۆحماندا دوودڵی دروست دەکات: "بێگومان هیچ شتێك بەلای ئەقڵەوە لەوە داخورپێنتر نیە کە بڵێین تاوانی مرۆڤیەکەم دابەزی بەسەر ئەو مرۆڤانەدا کە لە دوایەوە هاتن و هیچ دەستێکیان تیایدانەبوو. نەك هەر پێدەچێ کە ئەم گواستنەوەیە ئەستەم بێت بەڵکە ئەو پەڕی ناهەقیشە.. بێگومان هیچ شتێك بە ئەندازەی ئەم باوەڕە مایەی شۆك نیە بۆ ڕۆح". هەر بۆیە ملکەچ پێکردنی هزر تا ئەندازەی ئیمان پێهێنان بەم باوەڕە لە هەموو قوربانیدانێکی دیکە زیاتر شایانی پاداشت دانەوەیە، بۆیە خودا ملکەچکردنی ئەقڵی پێ باشترە لە فیزو لەخۆبایی بوونکەی تاوەکو: "ئەو هێزە خۆ بەزلزانە هێزی مشتومڕە سەرشۆڕ بکات، کە بە وتەی خۆی دەبێ ببێتە دادوەری ئەو شتانەی کە ئیرادە هەڵیاندەبژێرێ و، بۆ ئەوەی چاری دەردی ئەم ئیرادە نەخۆشە بکات کە بە هۆی پەیوەندیە گڵاوەکانیەوە تەواو خۆی خراپ و گەندەڵ کردووە". هەرکەسێك کە لە فیزی ئادەم خۆی بێبەری بکات





دەستپێشخەریەکی پێویست دەکات. ئیدی ئەوکاتە خودا خۆی پیشان دەدات و ڕاڤەی ڕاستەقینەی سروشتی مرۆڤ و گەردونی بۆ کەشف دەکات.. ئای کە ئەمەش چ پاداشتێکە!"

## بەڵگە مێژووییەکان

هەروەها کۆمەڵێك هۆکاری مێژوویش هەن کە وەکی پاسکال دەڵی پێویستە هانی کەسی مەسیحی بدەن بەرەو ئایینی مەسیحی و مانەوە لەسەر ئەو ئایینە. بەڵام پاسکال هیچی تازە باس ناکات بەڵکە دەگەڕێتەوە بۆ بەڵگە باوە ناسراوەکان کە ئەمانەن:

بەڵگەیەك هەیە کە لە "نەمریی ئایینی مەسیحی"ەوە وەرگیراوە، ئەو ئاینیەی کە لەسەر باوەڕبوون بە دابەزینی مرۆڤ لە دۆخێکەوە کە لەگەڵ خوداداسەرووەرو پەیوەندیدار بووە بۆ دۆخێك لە ناسۆرو پەشیمانی و دوورکەوتنەوە لە خودا. بەڵام لە دوای ئەم ژیانە، بە هۆی مەسیحێکی فریادڕەسەوە دەگەڕێینەوە بۆ دۆخی یەکەمجارمان، مەسیحێك کە دێتە سەرزەوی و هەمیشە لەسەر زەویشە، هەموو شتەکان تێپەڕین و بەسەرچوون تەنها ئەم شتە





مایەوە کە هەموو شتەکان لەبەر خاتری ئەو دروست کراون".

".. با سەرنجی ئەوە بدەین کە چاوەڕوانی مەسیح لەوەتی دەستپێکردنی دونیاوە بەبێ پچڕان بەردەام بووەو،.. کە هەمیشە کەسانێکیش هەبوون دەیانوت خودا بە سروش پێی ڕاگەیاندووین کە فریادڕەسێك لەدایك دەبێ میللەتەکەی ڕزگاردەکات و،.. کە ئیبراهیم لە دوایدا هاتووە دەڵی سروشم بۆ هاتووە کە ئەو فریاد ڕەسە لە یەکێك لە ڕۆڵەکانی من لە دایك دەبێ،..

کە یەعقوبیش وتویەتی لە یەهوزدا لەدایك دەبێ‌و، کە موساو پێغەمبەرانی دواتریش هاتوون تاوەکو هەواڵی کاتی هاتن و شێوازی ئەو هاتنە ڕابگەیەنن و، کە وتویشیانە ئەو شەریعەتی ئێستا تەنها لە چاوەڕوانی شەریعەتی مەسیح دا دروست بووەو، کە شەریعەتەکەیشیان هەمیشەییە تاو ئەو کاتەی شەریعەتە نەمرەکەی ئەو دێت و، کە دواجار مەسیحیش هاتووە هەموو پێشبینیەکانی هێناوەتەدی. بە ڕاستی ئەمە شتێکی جوانە".

بەڵگەیەکی تریش هەیە کە لە هاتنەدی پێغەمبەرایەتیەکانەوە وەرگیراوە.





"گــــەورەترین بەڵگــــە لەســــەر مەســــیح پێغەمبەرایەتیەکانــە. خــودا لــە مــاوەی هــەزارو شەسسەد ساڵدا پەیامبەرانی ناردووە، لە دووایدا ئـەم پەیامبەرییە بە هۆی جولەکەکانــەوە بڵاوبـووەوە کـە لە ماوەی چوار سەد ساڵدا لەگەڵ خۆیاندا بە هـەموو دونیادا بڵاویان کردەوە. ئەمە ئەو سەرەتایەیە کە بۆ لـەدایکبوونی مەسـیح ســازکرا، ئــەو مەسـیحەی کـە پێویستە هەمووان ئیمان بە بیروباوەڕەکەی بهێنن".

دواجـار پاسـکال لـە موعجیزەکانـەوە بەڵگەیــەکی بنـەبڕ دەردێنـێ بـۆ سـەلماندنی خودایــەتی مەسـیح. هەندێ کەس نکوڵی لە بوونـی موعجیزەکـان دەکـەن، بـەڵام بەهەڵـەدا چـوون. "ئەگـەر هــەموو ئەوانــە ناڕاست بوونایە، هیچ شتێك ڕاسـت نـەدەبوو:". هـەر بۆیە چەندین موعجیزەی تریـش هـەن. ئایـا پاسـکال بە چاوی خۆی ئـەوە نـەبینی کـە چـۆن چۆنـی دڕکـە پیرۆزەکـە چـاوی کچەکـەی خوشـکەزای چـاککردەوە. وەکـی مەسـیحیش دەڵـێ، ئەگـەر ئێـوە بـاوەڕ بـە مـن ناکەن باوەڕ بە موعجیزەکان بکەن. کەواتــە بـابزانین کــــە چــــۆن دەریاندەخــــەین و دەرەنجامیــــان لێ





دەردەهێنین بەو جۆرەی کە حەزرەتی مەسیح داوامان لێدەکات.

بەم پێیە هەقیقەتی مەسیحیەت جێی گومان نیە، چونکە ئایینە بتپەرستەکان و هاوشێوەکانی پشت بە ئەفسانە دەبەستن، بەڵام کتێبی پیرۆز پیشت بە ئەفسانە نابەستێ، سەرچاوە بەڵگەیەکە وشەکانی پیرۆز بووەو لە گومان پاك بووەتەوە.





## بەشی شەشەم
## چۆن چۆنی ڕاڤەی مەسیحیەت بکەین

ئێستا ماوەتەوە کە بزانین بە چ جۆرێك پێویستە ڕاڤەی مەسیحیەت بکەین.

ئەم مەسەلەیە چەندین مشتومڕی جۆراوجۆری دروستکرد، مەترسیدارترینیشیان ئەو مشتومڕەیان بوو کە لە ڕۆژگاری پاسکال دا لە نێوان مەسیحیەکان و جانسینیەکاندا کرا.

### ڕەخنەی ڕاڤەی مەسیحیانە

پاسکال ڕاڤە مەسیحیانەکە بە ڕاڤەیەکی خراپ و قێزەون دادەنێ چونکە:

یەکەم: مەسیحیەکان بە هۆی ئەم تێڕوانینەیانەوە سەبارەت بە یارمەتی پێویست "العون الکافی" هەمان بیدعە پیلاجییە[10] کۆنەکەیان نوێکردەوەو، بە بەکارهێنانی زمانی مەسیحییانەش هەمان ئەو هەڵەیەیان کردەوە کە





ئـەبکتیتۆس بــە زمانــە بــت پەرســتانەکەی خــۆی کردبووی. هێندە لە خۆشیان بایی بووبوون وایان پێ باش بوو کە لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بن. ڕاست نیـە کـە هەمیشـە لـەنێو ڕۆحــی مــرۆڤ دا پارمــەتی پێویست هەیـە بـۆ پاڕانـەوە لــە خــودا، تەنــها هــەر پاڕانـەوە لـە خودابـەس نیـە تــاوەکو بــەو یارمەتیــە کارایــە کۆمــەکمان بکــات کــە پێویســتمان پێیــەتی. دروست وەك دەڵێن ئادەم: "هاوڕێیەکی بەکـەڵك بـوو یارمــــەتی لــــەکیس چـــوو". وەکـــی پــــەترۆس پێغەمبەریش ڕایگـەیاند، خـودا هـەڵبژاردەو نـەفرەت لێکراوەکـانی خـۆی هـەڵبژاردو دایمـەزراندن. کەواتــە ڕەوشــێکی حــەتمی هەیــە کــە لــە چــارەی هــەموو بوونەوەرێك نووسراوە. خودا خۆی بە یارمـەتی کـارا کۆمـەکمان دەکـات یـاخود لێمـانی قەدەغـە دەکـات. نــهێنی چاکــەو خراپەکاریەکانیشــمان ئــا لێرەدایــە. "ئێمــە هیـــچ شــتێك لــە کاروکردەوەکــانی خــودا تێناگەین ئەگەر ئەوە نەکەینە سەرمەشق بۆ خۆمـان کە خودا ویستویەتی هـەندێ خـەڵك چەواشـە بکـا و ڕێگای ڕاست پیشانی هەندێکی تری بدات".

ڕاسـتیش نیـە کـە ئـەخلاق وەك خـۆی هـەر بـە ئـەخلاقێکی مەسـیحی دەمێنێتـەوە ئەگـەر ئێمـە بــە





بیـانووی سـازاندنی لەگـەڵ ژیـانی ڕۆژانـەو ژیـانی کۆمـەڵگاییدا ئاسـانکاری لـە پرەنسـیپەکانیدا بکـەین. ئەوە ئەخلاقێکی کەمتەرخەمە! ئەوە بە گیانی خـۆم قەسم تەواو پێچەوانەی مەسیحیەتە.

پاسـکال بـەردباران و بگـرە گالتـە بـەو کەسـانە دەکات کەئەم کارە دەکەن و ئینجا لافی ئەوە لێدەدەن کە گوایە بە یارمەتی دەسەڵاتە سیاسیەکان دەسەڵاتی خۆیـان دەکێشـن بەسـەر کڵێسـادا. مەسـیحیەکان پرەنسـیپی بـیرورا ئەگەرییـەکان "الاراء الإحتماليـة"یـان هێنایـە نێـو ناوانـەوە. ئەگـەر حـەزتکرد شـتێك بکـەیت ویژدانـت ڕەتـی بکاتـەوە ناچـار نیـت کـە بـە زەرورەت دەسـت لـەو شـتە هـەڵبگریت و نەیکـەیت. دەسـت بکـە بـە پشـکنینی دانراوەکـانی حەڵاڵکـەرانی کێشـە ویژدانیـەکان و بـە تایبەت دانراوی مەسیحیەکان، بزانـە ئایـا کەسـێکیان لەنێودایـە کـە ڕوبـەڕوی حاڵـەتێکی هاوشـێوەی حاڵەتەکـەی تـۆ بووبێتـەوە و پـێی وایبووبـێ کـە دەکـرێ داکۆکـی لـە چارەسـەرێك بکرێـت کـە لەگـەڵ ئارەزووە شـاراوەکانی تـۆدا بگونجێـت. ئەگـەر تووشـی کەسـێکی لـەو جـۆرە بوویـت کەواتـە تـۆ (ڕایـەکی





ئەگەرییانە)ت هەیە. تەنها هەر ئەمەندەش بەسە بۆ دەرچوونت بەبێ تاوان ئەگەر وێڕای هەموو نارەزاییە ڕوو لەسەرەکانی ویژدانیشت هێشتا هەر شوێن ئارەزووەکانیشت کەوتیت. ئای لەم پرەنسیپە ناشیرینە، ئەوەی کە زیاتر ناشیرین و مەترسیدارتریشی دەکات ئەوەیە کە لیستی ناوی ئەو لاهوتییانەی کە تەنها حوکمدانیان بەسە بۆ دۆزینەوەی (بۆچوونێکی ئەگەرییانە) لە ناوی کەسانی بە ئابڕوو بەتاڵەو پڕە لە ناوی کەسانی هیچ و پووچ!

هەروەها مەسیحیەکان ڕێگایاندا بە پارێزە زەینیەکان "التحفظات الذهنية- Restrictions mentales"*. بۆ نموونە پرسیارت لێدەکرێت کە ئایا دزییت کردووە. ڕاستیەکەی تۆ دزییت کردووە بەڵام لەو ڕۆژەدا نا. ئەوکاتە بە دەنگی بەرز بە "نەخێر" وەڵام دەدەیتەوە، لە دواییدا بە دەنگێکی هێواش ئەمە بۆ شایەتیەکەی خۆت زیاد دەکەیت و دەڵێیت: "ئەمڕۆ دزییم نەکردووە". ئیدی جگە لە هەڵەیەکی

---

* ئەم چەشنە هەڵسوکەوتە فێڵە یاسای "الحيل الشرعية"ەکانمان بیردەخاتەوە (و. عەرەبی).





بچوك تۆ هیچی زیاترت نەکردووە. پاسکال نارەزایی خۆی دەردەبڕێو دەڵێ:

ئەمە مانای درکاندنی درۆیە بە دەنگی بەرزو وتنی ڕاستییە بە دەنگی هێواش، ئای کە ئەمەش چ فێڵێکی قێزەونە!

هەروەها مەسیحیەکان دەڵێن بۆ خۆدزینەوە لە تاوانێکی گەورە کە یارمەتی خوداییمان لە کیس دەدات هێندە بەسە کە بزانین چۆن چۆنی مەبەستی خۆمان ئاراستە دەکەین و، کۆنترۆڵی پێویستمان هەبێ بەسەر مێشکماندا تاوەکو لە کاتی گونجاوی خۆیدا ئەنجامی بدەین، چونکە مەبەست پاساوی هۆ دەداتەوە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك داوای زۆرانبازی لێکردم دەتوانم بێ هیچ تاوانکردنێك بە شمشێرەکەمەوە بچم بۆ پیاسەکردن لە شوێنی وادەی زۆرانبازیەکەماندا، ئەگەر من پەلاماری دوژمنەکەمم دا تاوانبار دەبم و شایانی ئەشکەنجەی دۆزەخم. بەڵام ئەگەر دانم بەخۆدا گرت هەتا ئەو پەلامارم دەدات منیش لەکاتی هەستانم دا بە دژە پەلامارێك تەنها مەبەستم داکۆکی دەبێ لە خۆم، کەواتە دەتوانم بە شێوەیەکی تەواو ڕاست و ڕەوا شەڕ بکەم.





بـەمجۆرە دەروازە لەبــەردەم هــەموو تاوانــەکاندا دەکرێتەوە.

هــەروەها مەســیحیەکان کۆمــەڵێك پەرســتن و نیشــانەو ســروت و ئاگــاداری بچوکیــان داهێنــا کــە راســپاردەی رۆحــە خواپەرســتەکانیان پێدەکــردو ستایشی رۆڵیـان دەکـرد لـە پێنـاو رزگـاربون دا، لـە نموونــەی ئــەو دروشمانــە: لەگــەڵ خـۆدا هــەلگرتی چراوگــی پــیرۆز، شــێوازێك بــۆ درکــاندنی نــاوی مەسیح و مریەم لە هەندێ یادو بۆنەکان دا، سوژدە، نیگارکردنی نیشانەی خاچ، بـەم شـێوەیە جۆرێـك لـە بتپەرستایەتیان داهێناو جەختیش لەسەر کاریگەریە سـەیرو سـەمەرەکەی دەکەنـەوە. ئـای ئەمــە چـەندە باوەڕێکی خراپە! پاڵپێوەنانی خەڵکانیساویلکە بەرەو باوەڕهێنــان بــەوەی کــە بــە تەنــەها: "تۆببــەکردن لەســەرەوەختی مـردن دا بێئـەوەی ژیـانی گــەندەڵ و خراپـی خۆیـان بگـۆڕن" بەسـە، یـاخود ئەگـەر ئـەم هۆکــارە هیــچ و پوچانــە بەکاربــهێنن "خــــودا دەیانژێنێتەوە"، ئەمە بە بـاوەڕی پاسـکال ڕەفتارێکـە "زامنــی مانــەوەی خراپــەکاران دەکــات لەســەر خراپـەکاری خۆیـان بـە هـۆی ئـەو بیرۆکـە چەوتـەی کەلـە متمانــەی بێســەروبەرەوە دروسـت بـووە، لـە





جیاتی ئەوەی کە  بـە تۆبـەکردنێکی ڕاسـتەقینە کـە تەنــها یارمـــەتیخودایی دروســـتی دەکـــات لـــەو خراپەکارییە دەریانبهێنێتە دەرەوە".

## خوا پەرستیی ڕاستەقینە چیە؟

نەخێر نا، نە ئەوە ئـەخلاقی ڕاسـت و دروسـتەو، نە ئەوەش ئایینی ڕاستەقینەیە.

خواپەرستییو ئاییندارى واتە خوداوان لە هەموو شـتێکی دیکـە زیـاتر خۆشـبووێت و، هــەموو شــتێکی تریشـمان تەنـها لـە خـودادا خۆشـبووێت، واتــە بــە گوێــرەی ئــەو بیرۆکەیــەی کـــە پێویســـتە لـــەبارەی بایـــەخ و دادپـــەروەری و بەخشـــندەیی ئـــەو وێنای بکەین.

ئـاییندارى واتــە "لــە بــەردەم ئــەم بوونـــەوەرە گشـتیەدا بڕەوێینــەوە کــە چــەندین جـار تورەمــان کـردو، کــە دروســت هــەر کــاتێك بیــەوێت دەتوانــێ لـەنێومان بـەرێت" و "دان بنێـین بـەوەدا کـە ئەگـەر ئـەو نەبووایـە ئێمـە لـە هـەموو شــتێکدا کەنــەفت و بێتوانـــا دەبوویـــن و، تەنـــهاو تەنـــها شـــایانی تورەیی ئەوین"..





بەم پێیە خواپەرستیی گرتنەبەری ئەو ڕێسا ڕەفتاریە دووفاقەیە کە پاسکال سەپاندبووی بەسەر خۆیدا، کە ئەمەیە:

1-دوورکەوتنەوە لە هەموو لەزەتێك.

2-بەسکردن بەو شتانەی کە پێداویستن، پاشان قێزو بێزکردن لە هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤەکان وا ڕاهاتوون کە لە ڕیزی پێشەوەی بایەخدانەکانیاندا دایبنێن، هەموو شتێك کە پەیوەندی بە جەستەو بەڵکە تەنانەت کەپەیوەندی بە هزریشەوە هەبێ، خواپەرستیی ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی زانستیی و دۆزینەوەی هەقیقەتی زانستایەتی شتەکان بە کارێکی نائابڕوومەندانە دابنێین و، لە کەمەربەستنی قایشێکی بزماراوی و لەخۆدانی کوشندەیە ئەگەر دۆزینەوە زانستیەکانمان هەستی لە خۆبایی بوونمان لەلا دروست بکات.

خواپەرستیی ئەوەیە کە هەژارانمان خۆشبوویت و هەرچیەکمان هەیە بیاندەینێ و چەندە بایەخ بە خۆمان دەدەین هێندەش بایەخ بەوان بدەین ئەگەر لە سەرەمەرگیشدا بێت، هەروەها کات و سەرمایەی خۆمانیان بدەینێو، دامالڕاو لە هەموو شتێك و دوور لەهەر بوونەوەرێك بژین.





ئەمە مانای وا ناگەیەنێ کە کەسوکاری خۆمانمان خۆش نەوێت، بەڵکو تەنها بە ئەندازەی وابەستەییان بە خواپەرستیەوە خۆشمان بووێن، هەرچی چاکەو خراپەیەکیش کە بەسەریاندا دێت بە هەڵێکی بزانین بۆ ستایشکردنی خودا، ئەویش ئەوەیە کە هیوای سادەیی و خاوێنی ڕۆح بخوازین و بەوپەڕی خاکێتیشەوە هەموو ئەو ئامۆژگاری و ڕاسپاردانە وەربگرین کە کەشیش دەمانداتێ‌و، بەخۆ بەدەستەوەدان و بەڵکە بە شادی و کامەرانییەوە کۆست و بەڵا وەربگرین.

دواجار ئاییندارى ئەوەیە کە لە کەسانی زاهید و خواپەرست بین و دەست لەبیرکردنەوە لە زامەکانی مەسیحی لە خاچ دراو هەڵنەگرین وەك تۆبەکردنێك لە تاوانەکەی ئادەم و تەنها بە تێڕوانینی خودا تەماشای شتەکان بکەین و حوکمیان لەسەر بدەین. ئەگەر ئەمانەمان کرد هەست بە دڵنەواییەکی سەیرو شادییەکی سەمەر دەکەین. ئێستا با ئەم پەیامە بخوێنینەوە کە پاسکال لە ساڵی 1651 بە بۆنەی مردنی باوکیەوە نووسیویەتی:

"ئەگەر لە ڕووی ویستی خوداو دادپەروەری حوکم و





داهێنــەریی بایەخەکەیــەوە تەماشــای ئـــەو ڕووداوە بکــەین، بــە کڕنووشـــەوە ســـوژدە بـــۆ شـــکۆمەندی نهێنیـــەکانی خـــودا دەبـــەین و ڕێـــز لـــە پـــیرۆزیی حوکمەکانی دەنێین و شێوەی بەڕێوەچوونی بایــەخی پیرۆز دەکەین".

لـــە ســـاڵی 1656دا بـــۆ خـــاتوو "دی ڕوانـــیز"ی نووسوەو دەڵێ: "ئەوپەڕی کۆشش دەکەم بـۆ ئـەوەی کە لـە هیـچ شـتێك خـەمۆك و دڵتـەنگ نـەبم و پێـم وابێ ئەوەی کە بوو نەدەتوانرا لەوە باشتر ببێ".

وازهێنـان لـە دونیـا، دەسـتبەرداربوون لـە خـود، خۆتەرخانی تەواو بە ئیمان و میهرەبانییەوە بـۆ خـودا، ئەمانـە واتـای ئـەو دەسـتەواژانەن کـە قوڵـترین بـەش لـە فەلسـەفە ئایینیەکـەی پاسـکالی تیـادا بەرجەسـتە دەبـێ. مەسیح بە خودا دەڵـێ: لە پێنـاوی تـۆدا خوێنـی خۆمـم وشـك كـرد، پاسـكال وەڵام دەداتــەوەو دەڵــێ: خودایـــە، هەموو شتێکت پێ دەبەخشم.





**پاسکال و ئەخلاق**

ئەگەر ئێستا بمانەوێ گەورەیی ئەم پیاوە بنرخێنین دەبێ ئەوەی خوارەوەمان لەیادبێت:

بە پێچەوانەی زۆربەی ئەو فەیلەسوفانەوە کە لە نووسین لە بواری ئەخلاقدا شارەزا بوون بەلام پرەنسیپەکانی خۆیانیان نەخستە بواری جێبەجێکردنەوە، پاسکال تەنها بە ئامۆژگاریدان بە وتە بەسی نەکرد بەڵکە قسەی تێکەڵ بە کردار کردوو لەم بارەیەشەوە نموونەیەکی باش بوو. بێگومان کات و ساتی وا هەبوو کە لاوازو بێتوانا بوو، ماوەیەکیش لەگەڵ دۆق دی ڕوانیز و میرێ و میلتۆن دا تێکەلاوی (کۆمەلگا) بوو، هەروەها وتارێکی دەربارەی ئارەزووەکانی خۆشەویستی نو وسی و تیایدا باوەڕی وابوو کە ئەوکاتە ژیان جوان دەبێ کە بە خۆشەویستی دەست پێ بکات و بە خواست و ئارەزوو کۆتایی پێ بێت. هاوکات بە توندی داوای ئەوەی دەکرد کە بەرایی بدرێت بە هەندێ لە دۆزینەوەکانی. بەلام، وێڕای هەموو ئەوانە، لە کاتێکی زووەوە لە ژیاندا بووە زاهید و





نموونەیــەکیش بــوو بــۆ خــاوێنیی مەســیحی، ئـــەم بیریــارە بلیمەتــە کــە لــە تەمــەنی دوانـــزە ســاڵیدا پرەنسیپەکانی ئەندازەی دۆزییەوەو، لە شانزە ساڵیدا لێکۆڵینەوەیـەکی لەســەر قوچەکـەکان نووســیو، لــە بیست ساڵیدا ئـامێرێکی ژمـێرەی دروست کـردو، لـە بیســت و ســێ ســاڵیدا تاقیکردنــەوە ســەلمێنەرەکانی بوونــی بۆشــایی دۆزییــەوەو، لێکۆڵینەوەیەکیشــی دەربارەی هاوسەنگی شلەکان نووسی کە تـا ئێستایش نرخ و بەهای خۆی هەر مـاوەو، لـە دواییـدا "پەیامـە گوندییــەکان" پەیامــە سەســورهێن و جوانـــەکانی نووسی و ئینجا کتێبی "ئەندێشـە"ی بـۆ داکۆکـی لـە مەسیحیەت نووسی...

هاوکات ئـەم بیریـارە مەزنـە لـە هـەموو خـەڵکی زیاتر خواپەرست و ملکەچ و چاکەخواز بوو.

پاسـکال کــە لــەوەتی تەمــەنی هــەژدە ســاڵییەوە نــەخۆش و لــە چـوار ساڵی دوایـی تەمـەنیدا بێتوانـا بوو لە ئیش و کارکردندا، جگە لە کەڵك وەرگرتن لە نەخۆشیەکانی خۆی کە بە هـەلێکی خودایـی دەزانـی بــۆ قوربـــانیدان و کۆنـــترۆڵکردنی خـــودو بـــەزەیی هاتنەوە بە بێنەواياندا، بیری لـە هیـچ شـتێکی دیکـە نەدەکردەوە.





نـەخێر ئـەخلاقی پاسـكالیزم كالآیـەك نـەبوو بـۆ ناردنـە دەرەوە كـە تەنـها بـە قسـەكردن بـەس بكـات. بەڵكە ئـەم پیـاوە لەگـەڵ پرەنسـیپە ئەخلاقیـەكانیدا ژیا. وەختێكیش كە مـرد لـە سـەر جـل و بەرگەكـەی نوشـتەیەك دۆزرایـەوە كـە وەكـی یـادەوەری شـەوێكی تەسەوف كە تیایدا هەستی بە لەرزێكی بـاڵا كـرد بـە پەل و پۆیدا تەشەنە دەكات پاراسـتبووی، ئـەوەی كـە ئەو شـەوە پاسـكال هەسـتی پێكـرد هـەمان ئـەو شـتە بوو كە كەسانێكی تایبەت لـە كـاتی پـەیوەندی كـردن بە زاتی خوداییەوە هەستی پێدەكەن.

نابێ بەزەییمان بێت بـە حـاڵی پاسـكال دا. بـا بـە تایبەت ئەو نووسینە بخوێنینەوە كە بـۆ خـاتوو "دی ڕوانیز"ی نووسیوەو دەڵێ: "ئەگەر خۆشی و لـەزەتی ئێمـە لـە خۆبێبـەش كـردن و خواپەرسـتی و سۆفیگەرێتیدا شیرینتر نەبووایە لـە لـەزەتی تـاوان و خراپەكاری، وازمان لە خۆشی و شادی دنیا نـەدەهێنا بۆ ئەوەی كە خاچی مەسـیح لـەئامێز بگریـن. وەكـی تیر تۆلیانیش دەڵـێ: "كـەس پـێی وانـەبێ كـە ژیـانی مەسـیحیەكان ژیـانی خـەم و خەفـەت و خەمۆكییـە. ئێمـە بـۆ لـەزەتێكی زۆر زیـاتر نـەبێ دەسـتبەرداری چێژو خۆشییەكان نابین".





## بەشی حەوتەم

## تێڕوانینێکی گشتی

بێگومــان کــۆی پرەنســیپە بنەڕەتیــەکان لــە فەلسـەفەکەی پاسـکال دا مایـەی سەرســامی ئێمەیــە، هــــەروەها ســــۆفیگەرێتی و بیرکردنــــــەوە (جانسـینی)ەکەیشـی بـە لامانــەوە سـەیرو جێگــای سەرسـوڕمانە. کێ لـە ڕۆژگـاری ئــەمڕۆماندا هەسـت بەو چەشنە "لـەرز"ە دەکات کـە لـەلای پاسـکال ئـەو قەیرانـە فیکـری و ئەخلاقیـەی دروسـت کـرد کەلـە کتێبی "ئەندێشەدا" بەرجەستەیە؟

بــەلاّم ئەگــەر ئێمــە لــە وردەکارییــەکانی بیروباوەڕەکانی زیاتر بە ئاگابین وەك لە تێکڕای ئـەو بیروباوەڕانـە، جگـە لـە سەرسـام بـوون بـە جدییـەتی زۆربەیان و سیمای بوێرانــەیان هیـچ چـارێکی ترمـان نیـە. بڕشـتیەکی سـەیر لـە بیرکردنــەوەداو نــەرم و نیانیـەکی سـەمەر لـە دەربڕیـن و گوزارشـت کردنـدا سیمای بیروباوەڕەکانی پاسکالە. ئەمانەمان لە هەندێ لە تێڕوانینە باڵاکانیدا بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە لەو چەند لاپەڕەیی پێشوودا ئێمە لەبەردەم ئەم دوو مەحاڵەدا دادەنێت: بێپایان لە گەورەیی و بێپایان لە





بچوکیـــداو، وامـــان لیٚ دەکـــات کـــە لـــە بـــەردەم دیمەنەکانیاندا مل بچەمێنینەوە. هاوکات لە هەندێ لە شیکردنەوە دەروونیەکانیشیدا ئەوانە دەبینین. با بۆ نموونە یادەوەریمان بگەڕێنینەوە بۆ ئەو چەند لاپەڕەی کە دەربارەی "خـەیاڵکردن و بیرکردنـەوە-المخیلــة" و کاریگەریـــە تێکدەرانەکـــەی لەســـەر بـــەڕێوەچوونی هـــزرو ڕێکخســـتنی کـــردەوە مرۆڤایەتیـەکان ڕەشـی کـردەوە، لـە بـارەی لێکـدژی هزری زانستی کە جگە لە دەرهێنـانی دەرەنجامـەکان لە ژمارەیەکی سنورداری پرەنسیپەوە چیدی نازانێ و هزری ئەدەبی کـە دەزانـێ بگەڕێتـەوە بـەرەو هۆکـارە فرەجـۆرو چەشـنەکان کـە دەوری ڕووداوێـك لـە ڕووداوەکانیان داوە، هەروەها لە بـارەی گەمـەکردن و ڕابواردن و ئەو خراپەکارییانەی کە پاڵی پێوە دەنـێ و ئەو مەترسیانەی کە دروستی دەکات و کە بۆچی مرۆڤ بە توندی وابەستەیە پێیانەوە.

هـەروەها لـە تێڕوانینـە جوانسـازیەکانی و لـە شـێوازی حوکمدانـی لەسـەر ڕەوان بێـژی و شـێواز (الاسلوب) و لـە ڕاڤـەکردنی گونجـاندنی ئێمـەدا بـۆ هاوتـابوون و لێکدانـەوەی بوونـی هـەندێ شـێوەی






ناشیرینی لێکنزیك وەك نزیکی هەندێ لـە شـێوەکانی جوانـــیدا دەیبینـــن. هاوکـــات لـــە تێڕوانینـــە مەزەندەکاریەکەیشـیدا بـۆ شـەڕ دەیبینـین کـە دەڵـێ: "بۆچی دەتەوێت بکوژیت؟ سـەیرە! تـۆ لەبـەری ئـەو بەر نیشتەجێ نیت؟ هاوڕێم! ئەگـەر تـۆ لەبـەری لای من نیشـتەجێ بووتایـە مـن خوێـن ڕێژدەبـووم بـەڵام کوشتنی تۆ بەم شێوەیە کارێکی ستەمکارانەیە. بەڵام لەبەرئـەوەی کـە تـۆ لەبـەری ئـەو بـەر نیشـتەجێیت هەربۆیـــە مـــن ئـــازاو قارەمـــانم و کارەکەیشـــم دادپەروەرانەیـە". ئەگـەرچی پاسـکال وای پیشـانداوە کـە شـتێکی بـەلاوە پەسـەندە چونکـە گێرمەوکێشـە دوردەخاتــەوە بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا هــەر خــۆی ئەمەیشـی نووسـیوە کــە دەڵــێ: "چ شــتێك هێنــدەی هەڵبژاردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی لە دایکبووی یەکەمی شانشین لەلایەن ئێمەوە، لە ڕێگای ڕاسـتەوە دوورە؟.. ئێمــە بـــۆ لێخوڕینـــی کەشـــتیەکە خانـــەدانترین گەشتیاری هەڵنابژێرین".

پاسـکال بـە بـەکارهێنانی ئـەم خاسـیەتە سـەرنج ڕاکێشانە کە دەیکەن بە یەکێك لـە گـەورە نووسـەران لە جیهاندا، گوزارشتی لـەو بۆچوونانـەی خـۆی کـرد: هـەڵچوون و ماتـەم و تورەبـوون، ئـەو سـیفاتانەی کـە





ڕەوانبێژییەکی توندی پێدەبەخشن و، ئەو گاڵتەجاڕیە باڵایەی کە دەیکەن بە زماندرێژێکی بێهاوتاو، غەریزەی جوانی کە ڕێگای وشەی وێناکەری گوزارشتکەری چەسپاو لە بیرو زەین دای پیشان دەدەن.

ئەو کەسەی کە لە سی و نۆ ساڵیدا ماتماتیکناسێکی بلیمەت و، فیزیکناسێکی‌نوێخوازو، ژێربێژێکی هەڵکەوتوو، هەجوکەرێکی دڵڕەق و، لە هەموو فەیلەسوفە سۆفیگەرەکانی دیکە قەناعەتپێکەرترو لە هەمووشیان کاریگەرتر بوو، لە مێژووی جیهان و فیکردا بەختێکی دەگمەنی هێنا.

**ئەندرێ کریسۆن**





# نەسکی سێیەم

## پاشماوەکانی

دەکرێ بەرهەمەکانی پاسکال بەسەر دانراوگەلێکی فەلسەفی، ئەخلاقی، ئایینی لە لایەك و، دانراوگەلێکی زانستی لە لایەکی ترو ئینجا نامەگۆڕینەوەکانیدا دابەش بکرێ، دیارترین ئەو کەسانەیش کە نامەیان لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکرد ئەمانە بوون: خاتوو بیرێ و جاکلین کە خوشکی بوون، باوکە نوێل، دی ڕیبیر، لیبایۆر، فێرما، خاتوو دی ڕوانیز، هێژا بیرێ.

چاپی کۆمەڵە گەورە نووسەرە فەرەنسیەکان (هاچیت، دوو بەرگ) کە هێژایان برۆنشفیگ، بۆترۆ، گازێ سەرپەرشتی دەرکردنی دەکەن، هەموو پاشماوەکانی پاسکالی لەخۆگرتووە. هەروەها هێژا سترۆفسکی سەرجەمی دانراوەکانی پاسکالی لە سێ بەرگ دا بڵاوکردۆتەوە. هەرچی دانراوە فەلسەفی و





ئـــەخلاقی و ئایینەکانیشـــە،/ چـــەند چـــاپێکی جۆراوجۆریان هەیە بۆ نموونە:

-وتووێـژی پاسـکال لەگـەڵ هێـزا ساسـی. ج. بـیرێ (کۆلان 1903).

-وتـــارێك دەربـــارەی ئارەزووەکـــان. ج. میشـــۆ (فۆنتیموان 1900) و ف. جیرۆ (هاچیت 1910).

-کورتـەی ژیـانی مەسـیحێك. میشـۆ (فۆنتیمـوان 1897).

-پەیامە گوندییەکان. ئەم پەیامانە بـۆ یەکـەمجار لە ماوەی نێوان 1656 بۆ 1657 لە چـەند نامیلکەیـەکی پچڕپچـڕدا دەرکـەوت. لـە دواییـدا پەیامـەکان کـە ژمارەیان هەژدە دانەیە لەیەك بـەرگ دا کۆکرایـەوەو (نیکـۆل) لـە سـاڵی 1657 لـە ئەمسـتردام لـەلای Elzevir چاپ و بڵاوی کـردەوە، بـەڵام بەرگەکـە نـاوی پیـا دی لاڤالی بڵاوکەرەوەی لەسەرە لە شاری کۆلۆن.

لـە چاپـە نوێیـەکانیش بـا ئامـاژە بکـەین بـۆ چاپەکەی ئۆگۆست مۆلینێ "لیمیر، دووبەرگ، 1891".

-ئەندێشە. لە دوای مردنـی پاسـکال، هـەموو ئـەو سەرنجانە کۆکرانەوە کە پاسکال بـۆ کتێبـی "داکۆکی لـە مەسـیحیەت"ی نووسـیبوون و کـە هێشـتا بـێ سـەروبەرو پـەرش و بڵاوبـوون، ئەمـە وەکـی ئیتیـان





بـیرێ دەڵـێ: "چونکـە تەنـها دەربڕینێکـی سـەرەتایی بوون لە ئەندێشەکانی کە لە ساتەوەختی بـە خـەیاڵ هـاتنیدا لەسـەر پارچـە کاغـەزی بچـوك تۆمـاری دەکردن. ئەمانە لـە ڕووی نووسـینەوە هێنـدە کـەم و کورِ فـەرامۆش کراوبـوون کـە بـە ئـەرك و مـاندوو بوونێکی زۆر نەبێ نهێنیەکانیان نەدەزانرا. یەکەمین کاری ئێمە ئەوە بوو کە هاتین وەك خۆی بەو تێکەڵ و پێکەڵیـەی کـە بەردەسـتمان کـەوت فۆتۆکۆپیمان کردەوە".

بڵاوکردنەوەی ئەم ئەندێشانە وەك خۆی کـارێکی ئەسـتەم بـوو. هـەروەها ڕۆشـنکردنەوەی هـزرە دردۆنگەکان و تەواوکردنی بەشە کەم و کورەکانیان و تـەواوکردنی کتێبەکـە لـە ڕێگـای مەبەسـتی دانەرەکەیەوە دیسان هەرکارێکی ئەستەم بوو. ئەگەر وامـان بکردایـە کتێبێکـی تـەواو جیاوازمـان بڵاودەکـردەوە. دواجـار بڕیارمـان لەسـەر ئـەوە گیرسـایەوە کـە تەنـها ڕۆشـنترین ئەندێشـەکان و نزیکترینیـان لـە کـامڵی و تەواوییـەوە بڵاوبکەینـەوە، تەنـها ئـەو ئەندێشانەیش لـەژێر هـەمان ناونیشـاندا





کۆبکەینەوە کە باس لە هەمان بابەت دەکەن و پاشماوەکەیشی لاببەین.

ئەرکەکە ئەرکێکی زۆر قورس و گران بوو. هەریەك لە ئارنۆ، نیکۆل، دۆق دی ڕوانیز و کەسانێکی تریش بەشداریان تیادا کرد. بەڵام دواجار ناچاربووین کە ڕەزامەندی جێلبرت بیرێ لەسەر هەندێ "ئارایشت و جوانکاری و ڕۆشن کردنەوەو نەقڵکاری و سەربارکردن" و لەسەر هەندێ دەستکاری لە دەقەکەدا وەربگرین.

چاپی ئەسڵی کتێبەکە کە لە چەند تیراژێکی ئێجگار سنوردارو لە ساڵی 1669دا چاپ کرا، بەو جۆرە پێشکەش کرا. بۆ ساڵی دوایش هەمان تێکست بە هەندێ دەستکاری کەمەوە بڵاوکرایەوەو ئەم چاپەیان ناونرا چاپی پۆرڕۆیال لەلای گلیۆم دیسپریز لە شەقامی سان جاك دەفرۆشرا. لە ساڵی 1711دا کەشیش لویس بیدێی کوڕی جێلبرت دەقی دەستووسەکەی تەسلیم بە دێری (سەن جێرمان دی بیرێ) کردولەم ڕێگایەشەوە چووە نێو کتێبخانەی نیشتمانیەوەو لەنێو کەلەپوری فەرەنسیدا بە ژمارە (9202 ) تۆمارکرا. هەروەها لە کتێبخانەی نیشتمانیدا دانەیەك لە دەقە ئەسڵیەکانی ئەندێشە هەیە کە





ساڵی 1670 بڵاوکرایەوەو ساڵی 1731 لە لایەن یەکێك لە کوڕەزاکانی جێلبرت بیرێوە درا بە ئەنجومەنی "سان مۆر" لە "سان جیرمان دی بیری".

چاپەکانی کۆندۆرسێ (1776) و بۆسۆیەو ئەندرێ بە گوێرەی چاپی پۆرڕۆیال کراون. لە ساڵی 1844دا فۆجێر بەپێی دەستنووسەکە چاپێکی پێشکەش کرد کە تا ڕادەیەکی زۆر تەواو کامڵ بوو، ئینجا چاپەکانی هاڤێ (1851) و مۆلینێ (1877) و میشۆ (1896) "میشۆ یەکەمین کەس بوو پێڕەوی ڕیزبەندکردنی دەستنووسەکەی کردو "برۆنشفیگ" دانراوو ئەندێشە، لە پۆلێنێکی نوێدا، 1897"ی بەدوادا هات. لە ساڵی 1906دا گازێ جارێکی تر تا ڕادەیەك پۆلێنەکەی پۆرڕۆیال ی گرتەوەخۆ. دواجار شۆڤاڵی (1925) و ماسێ (1929) پۆلێنگەلێکی نوێیان تاقیکردەوە، هەروەها تۆرنۆر (1938) کە تێکستەکەی بە هەموو گێڕانەوەو دەستکاریەکانی فۆتۆکۆپی کردەوە.





# هەڵبژاردە لە نووسینەکانی

## ئەندێشەی پەرت و بڵاو

گرنگترین شت لە ژیاندا هەڵبژاردنی پیشەیە، کە فاکتەری ڕێکەوت دەیبات بە ڕێگاوە. چونکە خوو بیناسازو سەربازو تەختەبەستان دروست دەکات. دەڵێن: فلان کەس تەختەبەستێکی زۆرباشە، هەروەها لە کاتی باسکردنی سەربازان دا دەڵێن: ئەوانە شێتن. بە پێچەوانەشەوە خەڵکانێکی تر دەڵێن: "تەنها هەر شەڕ مەزنە، هەرچی پاشماوەی مرۆڤەکانە دڕندەن". ئێمە لە تەمەنی منداڵیماندا لەژێر کا ریگەری ستایشی ئەم پیشانەدا کە بەرگوێمان دەکەوێ و ئەو ڕەتکردنەوەیەی هەموو پیشەکانی تردا کە دەیبستین، شتێك هەڵدەبژێرین. خوو کاریگەریەکی بەهێزی هەیە بە جۆرێك کە ئێمە هەموو بارودۆخێکی مرۆڤایەتی لەو کەسانەوە دروست دەکەین کە سروشت تەنهاو تەنها مرۆڤی لێ





دروست کـردوون. بێگومــان سروشــت بــەو چەشــنە ڕۆتین و لەسەر  یـەك شـێوەی بێگـۆڕان نیـە. کەواتـە ئەوە هەر خووە کە هەموو ئەم کارانە دەکات چونکـە دژایەتی سروشت دەکات. بەڵام هەندێك جار سروشت سـەردەکەوێت و مرۆڤیـش وێـڕای هـەموو خوویــەکی بــاش و خراپــی هــەر لەســەر غــەریزەی خــۆی دەمێنێتەوە.

⋆ ⋆ ⋆

سروشت چاو لە خۆی دەکات: ئەو دەنکە گەنمەی کەلەسەر خاکێکی بە پیت فڕێ درابێت سەوز دەبێ و بەردەگرێت. بە هەمان شێوە ئەو بنەماو پرەنسیپەی کــە لــەنێو هزرێکــی تەندروســت دا چێنرابــێ بەردەگرێ. هەموو شتێك دەستکردنی هـەمان خـوداو ملکەچ بە ڕێنو مایی هەمان خودان: ڕەگ و لق و پۆپ و بەروبووم، بنەماکان ئاکامەکان.

⋆ ⋆ ⋆

هەمیشە سروشت هەمان شت دووبارە دەکاتەوەو، هەمان ساڵ و ڕۆژ کات دەگێڕێتەوە. هەروەها ژمــارەو ماوەکانیش بە دوای یەکدا دێن. بەم شێوەیە جۆرێك لـە بێپایــانی و نــەمری ڕوودەدات. هەڵبــەت ئەمــە





واناگەیەنیَ کە لە هەموو  ئـەم شـتانەدا شـتی نـەمری بیَکۆتا هەیە، بەڵکە  ئـەم بوونـەوەرە سـنوردارانە بـە شێوەیەکی بیَکۆتا زیاد دەکـەن. بـەم پیَیـە، مـن پیێـم وانیە شتی بیَکۆتا هەبیَ تەنها ئەو ژمارەیە نەبیَ کە زیادبوونی بۆ  وەدی دەهێنیَ.

★ ★ ★

ڕەگ و ڕیشەی لەخۆبایی بوون بە جۆرێك  لـەنێو دڵی مرۆڤ دا ڕەگی داکوتاوە کە سەربازو خزمەتکارو چێشـت لێنـەرو بارهـەڵگر بـە خۆیـەوە دەنـازیَ و حەزدەکات کە کەسانی سەرسامی خۆی هەبیَ.  بەڵکـە تەنانـەت فەیلەسـوفەکانیش ئـارەزووی هـەمان شـت دەکـەن. ئـەو کەسـانەیش کەبـە نووسـینەکانیان پەلاماری ئەوە دەدەن لە ڕاستیدا حەزدەکەن شەرەفی نووسـینی باشـیان دەسـت گـیر بێـت. هـەروەها ئەوانـەیش کـە نووسـینەکانیان دەخوێننـەوە حەزدەکەن شەرەفی خوێندنەوەیان دەست گـیر بێـت. ڕەنگـە نووسـەری ئـەم واژانـەش هەسـتی هـەمان ئـارەزوو دایبگرێـت، لەوانەیـە ئەوانـەیش کـە ئـەم واژانە دەخوێننەوە دیسان هەمان ئارەزوویان هەبیَ.

★ ★ ★





هەرکەسێك دەیەوێت تەواو ئاشنای لەخۆبایی بوونی مرۆڤ بێت، هێندە بەسە کە لە هۆکارەکان و ئەنجامەکانی خۆشەویستی وردبێتەوە. هۆکارەکەی ئێجگار سادەیەو ئەنجامەکەیشی ئەوپەڕی مەزنە. ئەم شتە کەم و سادەیە زەوی و میرو لەشکرەکان و بەڵکە تەنانەت هەموو دونیا دەبزوێنێ.

ئەگەر کەمێك لوتی کلیۆپاترا کورت تر بووایە ڕووخساری زەوی دەگۆڕا.

★ ★ ★

ئەگەر ئەو دەنکە بەردە بچکۆلانەیە نەبووایە کە بۆری میزی ئۆلیڤەر کرۆموێل[11]ی گرت، ناوبراو هەموو سەرزەمینی مەسیحیەتی داگیر دەکردو بنەماڵەی پادشایەتی لەسەر تەخت لادەبردو، تا هەتایە بنەماڵەکەی خۆی بنەماڵەیەکی بەهێز دەبوو. بەڵام ئەو دەنکە بەردە بچکۆلانەیە بۆری میزی ئەوی قەپات کردوو بووە هۆی مردنی، ئیدی خانەوادەکەی بەرگی ملکەچییان پۆشیو، ئاشتی باڵی بەسەر هەموو جێیەکدا کێشاو، پادشای لەسەر تەخت لابراویش گەڕایەوە بۆ سەر عەرشی پادشایەتی خۆی.





**یاساکان و داد پەروەری**

... لەسەر چ شتێك سیستەمی دەسەڵاتی خۆی لە دونیـادا بوونیـات دەنێـت؟ لەسـەر ئـارەزووی هـەر تاکەکەسێك؟ ئـای لـەو پاشـاگەردانییە! یـان لەسـەر دادپەروەری؟ بەڵام خۆ ئەو دادپەروەری نازانێ.

بێگومـان ئەگـەر بیزانیایـە ئـەم بنـەما مرۆییـە گشـتیەی دانـەدەنا کـە دەڵـێ پێویسـتە هـەموو تاکەکەسـێك شـوێن داب و نـەریتی وڵاتـی خـۆی بکـەوێت، ئەوکاتـە هـەموو میللـەتان ملکـەچ بـە دادپـەروەری ڕاسـتەقینە دەکـران و یاسـادانەرانیش چاویـان لـە ئارەزووەکـانی فـارس و ئەڵمانـەکان نـەدەکرد لـە جیـاتی چـاوکردن لـەم دادپەروەرییـە چەسپاوو هەمیشەیە. ئەوکاتە دەمانبینی لە هەموو دەوڵەتانی دونیاو لە هەموو ڕۆژگارو سەردەمێکدا لە شوێنی ئەو دادپەروەری یاخود ئەو زوڵم و ستەمەدا باوی دەبوو کە لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر سیماکەی دەگۆڕێ. ئیجتیهادی دادگاکان بە کەمترین گۆڕان لە بەرزبوونـەوەی جەمسـەریدا دەگـۆڕێ، هـەروەها چارەنووسی هەقیقـەت بـەپێی کـەمترین گـۆڕان لـە





هێڵەکانی درێژیدا دەچەسپێ. ئەگەر چەند ساڵێکی دیاریکراویش بەسەر خاوەندارێتیدا تێپەڕ بکات یاسا بنەڕەتیەکان دەگۆڕێن. یاسا بەرواری خۆی هەیە، داخڵبوونی ئەستێرەی زوحەل بە بورجی شێر بنچینەی تاوانەکانمان پیشان دەدات. ئای لەو دادپەروەرییە کۆمیدییە کە ئاراستەی ڕووبار بەری پێدەگرێت! ئەوەی کە لە بەردەم چیای پیرینیدا هەقە لە پشتەوەیدا ناهەقە.

ئەوان دەڵێن دادپەروەری لەم نەریتانەدا نیە، بەڵکە لە یاسا سروشتیەکاندایە لە هەموو دەوڵەتێکدا. بێگومان ئەوانە ئەو کاتەڤیرسچمانە جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەگەر ڕێکەوت کە تۆوی یاساکانی مرۆڤایەتی چاندووە، لانی کەم تەنها لەسەر یاسایەك بیگرسایەتەوە کە هەمەگیر بووایە. بەڵام بۆ گاڵتەجاڕی، ئارەزووەکانی مرۆڤ ئەوەندە هەمەچەشنن کە بوونی ئەم جۆرە یاسایە ئەستەم بووە.

دزیکردن و زیناو باوك و ڕۆڵە کوشتن هەموو وا لە چارەیان نووسراوە کە بەکارو کردەوەی ڕەوشت بەرزانە دابنرێن، چ شتێك لەوە سەیروسەمەرەترە





که کەسێك لەبەر هیچ نا تەنها لەبەرئەوەی کە لەبەری ئەوبەری سنوردا دەژی، یان لەبەرئەوەی کە دەسەڵاتداری وڵاتەکەی لەگەڵ دەسەڵاتداری وڵاتی مندا لە ناکۆکیدایە، مافی ئەوەی هەبێ خوێنی من برێژێ.

بێگومان یاساگەلێکی سروشتی هەن، بەڵام ئەم ئەقڵە ژیرە گەندەڵە هەموو شتێکی گەندەڵ و خراپ کردووە.

ئەم شپرزەییەش بارودۆخێکی وەهای خوڵقاندووە کە هەندێك کەس جەوهەری دادپەروەری لە دەسەڵاتی یاسادانەر "سلطان المشرع"دا دەبیننەوەو، هەندێکی تر لە بەرژەوەندی دەسەڵاتدارو، کەسانێکی ترش لە داب و نەریتی ئێستادا. ئەمەش زامنترین شتە، چونکە بە بۆچوونی ئەقڵ خۆی، هیچ شتێك لە خۆیدا دادپەروەر نیە. هەمو شتێك لەگەڵ تێپەڕوبونی کاتدا لەق دەبێ. داب و نەریت لەبەر هیچ نا لەبەرئەوە دادپەروەری دەخوڵقێنێ چونکە پەسەندە. بنەڕەتی غەیبیانەی دەسەڵاتەکەیشی ئالێرەدایە. ئەوەی کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ بنەماکەی تێکوپێکی دەدات. هیچ شتێك هێندەی ئەم یاسایانە ناڕاست نیە کە





مەترسیەکان هەڵدەسەنگێنێ. هەر کەسێك لەبەر دادپەروەریەکەی پێڕەوی بکات پێڕەوی دادپەروەریەك دەکات کە ئەندێشەی خۆی نیگاری دەکێشێ نەك ڕۆحی یاسا. تەنها یاسایەکی رووتەو هیچی تر. هەرکەسێك بیەوێت بە دوای پاڵپێوەنەر بۆ ئەم یاسایەدا بگەڕێ هێندە لاوازو سوك دەیبینێ کە ئەگەر لەسەر تێڕامان لە شتە سەیرو سەمەرەکانی ئەندێشەی مرۆڤایەتی ڕانەهاتبێ تەواو سەرسام دەبێ چونکە ئەم یاسایە لە ڕابوردوودا لەلای نەوەیەك لە نەوەکان جێی ڕێزو نەوازشت بووە. هونەری پەلاماردان و تێکشکاندنی دەوڵەتان لەسەر لەقاندنی داب و نەریتە چەسپاوەکان و گەڕانەوە بۆ بنچینەکەیان دامەزراوە بۆ تانەو تەشەردان لە دەسەلات و دادپەروەیەکەی. دەڵێن پێویستە بگەڕێینەوە بۆ یاسا بنەڕەتی و سەرەتاییەکانی دەوڵەت، ئەو یاسایانەی کە داب و نەریتێکی زاڵمی ستەمکار لەگەڵ خۆیدا بردی و ڕۆی. ئەمە شێوازێکی زامنە بۆ لە کیسدانی هەموو شتێك. چونکە هیچ شتێك دادپەروەرانە نیە ئەگەر بەم پێوانەیە بپێورێت. بەڵام میللەت گوێ بۆ ئەم چەشنە قسەو





قسەلۆکانە ڕادەگرێ، هەر بۆیە یەکێك لە یاسادانەرە داناکان وتوویەتی: زۆرجار بەرژەوەندی مرۆڤەکان وا پێو یست دەکات کە لە خشتە ببرێت. نابێ هەست بە هەقیقەتی دەست درێژی بکەن. پێشان دەست درێژی بەبێ هیچ هۆیەك و داخلٌ بەم یاسایانە کراوە بەلاَم ئێستا بووەتە شتێکی ماقولٌ و بەجێ. ئەگەر بمانەوێ کە بەم زووانە کۆتایی نەیەت دەبێ وەکی شتێکی هەمیشە ڕاست و ڕەوا وێنای بکەین و هەوڵبدەین سەرەتاکەی بشارینەوە.

⋆ ⋆ ⋆

وەختێك کە مەسەلەکە مەسەلەی جاڕدانی شەڕو کوشتنی بە هەزاران مرۆڤ بێت، تەنها تاقە یەك کەس دەرەقەتی ئەم مەسەلەیە دەدات، هەرچەندە کەسێکی مەبەستداریشە. پێویستە لەم چەشنە مەسەلانەدا پشت بە کەسێك ببەسترێ کە هیچ پەیوەندیەکی بە بابەتەکەوە نەبێ.





**جەوهەری من**

**من چییە؟**

ئەگەر کەسێك لەبەر پەنجەرەدا ڕابووەستێ بۆ ئەوەی ڕێبواران ببینێ، ئەگەر من لەوێوە بڕۆم ئایا دەتوانم بڵێم کە ئەو بۆ بینینی من ڕاوەستاوە؟ نەخێر. چونکە ئەو بە تایبەتی بیر لە من ناکاتەوە. ئەگەر کەسێك لەبەر جوانی کەسێکی دیکەی خۆش بوویێت ئایا دروست خۆشی دەوێت؟ نەخێر. چونکە ئەو ئاوڵەیەی کە جوانی کەسێك لەنێو دەبات بێئەوەی کەسەکە بکوژێت، کۆتایی بەو خۆشەویستیە دەهێنێ.

یان ئەگەر من لەبەر ئەو بڕیارو یادەوەرییەی کە هەمە خۆشیان بوویێم، ئایا من لە جێی ئەو خۆشەویستیەدام؟نەخێر. چونکە دەتوانم ئەو سیفاتانە ون بکەم بێئەوەی خودی خۆم ونبکەم. کەواتە ئەم (من)ە لە کوێدایە ئەگەر لە لەش و لە ڕۆحیشدا نەبێ؟ کەواتە لەش یاخود ڕۆحمان چۆن خۆش بوویێت ئەگەر لەبەر خاتری ئەم سیفەتانە





نـەبێ کـە هـەرگیز (مـن) دروسـت ناکـەن چونکـە سـیفەتگەلێکی لـەناوچوون؟ ئایـا جەهـەری ڕۆحـی مرۆڤـان، ئیـدی سـیفاتەکانی هـەرچۆنێك بێـت، بـە شێوەیەکی ڕووت خـۆش دەوێـت؟ نـەخێر ئەمـە ڕێـی تێناچێ و ناڕەوایشە.

کەواتـە ئێمـە هـەرگیز کـەسمان خـۆش نـاوێت، بەڵکـە تەنـها هـەندی سـیفاتمان خـۆش دەوێـت و هیچی تر.

## بـــیر

مـرۆڤ چیـدی نیـە جگـە لـە چڵـە قامیشێکـ، لاوازتریـن چڵـە قـامیش لـە سروشـت دا، بـەڵام قامیشێکی بیرمەندە. پێویست بەوە ناکات کە هـەموو دونیـا چـەك لەشـان بکـات بـۆ تێکشـکاندنی: چونکـە تەنها گەردیلەیەك لە هەڵم یـاخود تنۆکێـك لـە ئـاو بەسە بۆ کوشـتنی. بـەڵام تەنانـەت کـاتێك کـە دونیـا تێکیشی دەشکێنێ هێشـتا مـرۆڤ هـەر لـە بکوژەکـەی خانەدان ترە، چونکە دەزانێ کـە بمـرێ، بـەڵام دونیـا هیـچ شـتێك لـەو باڵادەسـتیە نازانـێ کـە بەسـەر مرۆڤدا هەیەتی.





کەواتە هەموو ئابڕوویەکی ئێمە لە هزردایە. با هەوڵبدەین زۆر بە چاکی بیربکەینەوە: ئائەمەیە بنەمای ئەخلاق.

★ ★ ★

تەنها لەنێو ڕێکخستنی بیرمدا نەبێ نابێ بە دوای ئابڕومدا بگەڕێم. تەنها بە هۆی بیرەوە لە دونیا تێدەگەم و لە کۆت ودیلێتیەکەیشی ئازاد دەبم.

★ ★ ★

دەتوانم مرۆڤ بەبێ دەست و بێ قاچ و بێ سەر بهێنمە پێشچاوی خۆم، بەڵام ناتوانم بەبێ هزر وێنای بکەم. چونکە ئەگەر هزر نەبووایە دەبوو بە بەرد یاخود ئاژەڵ..

★ ★ ★

مرۆڤ بە هزرەوە مەزنە.





**بەسەرهاتی جاك دیلبا**

پێم وت: باوكە! ئەمە ئەو برگەیەیە كە وابەستەیە بە (چاك دیلبا) وە. وتی: مەبەستت چیە؟ وتم: سەیرە! ئەدی لەبیرت نەماوە ساڵی 1646 لەم شارەدا چی ڕویدا؟ كەواتە تۆ لەوكاتەدا لە كوێ بوویت؟ وتی: لە یەكێك لە پەیمانگا دوورەكانمان لە پاریس خەریكی وتنەوەی گیروگرفتەكانی ئامانەت بووم. پێم وت: كەواتە پێم وابێ ئاگات لە بەسەرهاتەكە نیە، هەربۆیە پێویستە بۆتی بگێڕمەوە. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر پیاوچاكێك بۆ منی گێڕایەوە.

چاك دیلبا لە پەیمانگای كلیرمۆن لە شەقامی سان جاك لە خزمەتی باوكان (الآباء)دا كاری دەكرد. لە موچەكەی خۆی نارازی بوو بە مەبەستی باربووكردن برێك شتی دزی. باوكەكان هەستیان بە مەسەلەكە كرد و بە تۆمەتی دزیی ناوماڵ جاك دیلبایان توندی نێو زیندان كرد.ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم پێم وابێ لە شەشی نیسانی 1646دا بوو كە داواكە لە بەردەم دادگادا بەرزكرایەوە، چونكە ئەو





کەسەی کە ڕووداوەکەی گێڕایەوە ئاماژەی کردبوو بۆ هەموو ئەو وردەکاریە تاوەکو گوێگران باوەڕی پێ بکەن. جاك ی بەدبەخت پرسیاری لێکراو دانی نا بە دزینی هەندێ قاپ و قاچاخ دا. بەڵام وتی کە گوایە نەیدزیوون و.. بۆ بێبەری کرندی خۆیشی ڕێساکەی باوکە "بۆنی" بە بەلگە هێنایەوەو کتێبێکیشی خستە پێشچاوی قازیەکان کە یەکێك لە باوکەکان داینابوو کە گیروگرفتی ئامانەت ی پێ وتبووەوە. لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا "مۆنرۆج" ئەمەی پێشنیارکرد: "کتێبەکانی ئەو باوکانە کە ڕێساو بنەمای قەدەغەکراو لەخۆ دەگرێ، پێچەوانەی هەموو یاسا سروشتی و ئاسمانی و مرۆڤایەتیەکانە، زامنی لەقاندنی بناغەی هەموو خێزانەکان دەکات و ڕێگای هەموو دزییەکی ناوماڵیش دەدات،... ئەم کتێبانە ناتوانن پاکانە بکەن بۆ لێبوردن لەم تاوانبارە"، و ڕای وابوو کە ئەم خوێندکارە زێدە گوێڕایەڵ و دڵسۆزە شایانی ئەوەیە لەبەر دەرگای پەیمانگادا قامچی لێ بدرێت و، هاوکات پێویستە جەلادەکە کتێبی ئەو باوکانەش بسوتێنێ کە باس لە دزی دەکەن و لەژێر زەبری سزایش دا ڕێگانەدرێ





بەو کەسانە کە ئەم جۆرە ڕێسایە فێری خەڵکی بکەن.

★ ★

خەڵکی چاوەڕوانی ئاکامی ئەم پێشنیارەی مۆنرۆج بوون. لە ناکاو ڕووداوێك ڕوویدا دەرچونی بڕیاری دادگای دواخست. لەم کاتەدا بەندیەکە بە شێوازێکی نادیار ون بوو دیارنەما، ئیدی هەموو باس و خواستێك لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕاوەستا، بە جۆرێك کە جاك دیلبا لە زیندان دەرچوو تا ئێستایش نەگەڕاوەتەوە.

کابرا کە بەسەرهاتەکەی بۆمان گێڕایەوە وای وت هەروەها وتیشی کە پێشنیارەکەی هێژا (مۆنرۆج) لەنێو دەفتەری تۆمارەکانی دادگادا هەیەو هەر کەسێك بیەوێت دەتوانێ تەماشای بکات. ئێمەیش کاتێکی خۆشمان لەگەڵ ئەم بەسەرهاتەدا بەسەربرد.





**پەراوێزەکان:**

لە دوو توێی ئـەم کتێبـەدا کۆمـەڵێك نـاو هـاتووە کە لـە دەقـە عەرەبیەکـەدا وەرگـێڕی عـەرەبی هیــچ پـەراوێزێکی بـۆ نەکردبوونـەوە، مــن بــۆ کارئاسـانی زیاتر بۆخوێنـەری کوردی ئاشناکردنی بەو ناوانە کە ڕەنگە بەلایەوە نامۆبن و یەکەمجار بـێ بیانبیسـتێ و لەبەرئەوەی کە ئەو ناوانە کارەکتەرن و ڕۆڵی خۆیان هەیـە لـە ڕووداو بەسـەرهاتەکانی ژیـانی پاسـکال دا، ئەم پەراوێزەم بە پێویست زانی.

1-پۆرڕۆیال (Port-Royal): دێـر یـاخود کڵێسـایەکی ژنـان بـوو لــە سـاڵی 1204 لـە نزیـك شـاری پـاریس دروسـت کـرا. لـە ساڵی 1608 دایکـە (ئـانجلیك ئـارنۆ 1591-1661) سـەرلەنوێ تـازەی کـردەوە. لـە سـاڵی 1635 لقێکی تری لە پاریس دامـەزرێنرا کـە "سـان سـیران" سەرپەرشـتیبەڕێوەبردنی ڕۆحانیەکـەی دەکــردو لـە دوایـدا بـووە لانکێـك بـۆ جانسـینیزم. هـەندێ لـە پیاوانی یەکگرتوو (المتوحدین) لـە دەوری نیشـتەجی بوون و لە ساڵی 1648 دا خوێندنگایەکیان بۆ فێرکردن





دامــــەزراند "جـــان ڕاســـین" یـــەکێك بـــوو لـــە خوێندکارەکانی. لـە سـاڵی 1656 دێــرە لادێییەکـەیان چەوســـێنرایەوە. لـــە ســـاڵی 1709 ژنـــە کەشـــیش و ڕاهیبەکا نی نێوی دەرکران و دێرەکـەیش بـە تـەواوی ڕووخێنرا.

2-ئیکلیـدس (Eukleides) (سـەدەی سێیەمی پ. ز) ماتماتیکناسـێکی یۆنانیـە لـە ئەسـکەندەرییە وانـەی گوتووەتـەوە، دامەزرێنـــەری بنـــەماکانی ئـــەندازەی تەخت (الهندسة المسطحة)ە.

3-ڕیشـیلیۆ (Richelieu): کاردینـاڵ ڕیشـیلیۆ (1585-1642) یەکێکـــــە لـــــە گـــــەورە پیـــــاوە سیاسەتمەدارەکانیفەرەنسا، ماوەیەك وەزیری لویسی سـیانزەیەم بـوو. کاریگەرەرییـەکی زۆری هـەبووە لـە سیاســـەتی نـــاوخۆو دەرەوەو سیاســـەتی ڕۆشـــنبیری فەڕەنسادا. دامەزرێنەری ئەکادیمیای فەرەنسیە.

4-کۆرنیلیـۆس جانسـینیۆس (1585-1638) لاهـوت و زانایـــەکی ئـــایینی هۆڵەندیـــە بـــە هـــۆی کتێبـــی (ئۆگستینۆس) کە لە ساڵی 1628دا نووسراوەو لە ساڵی 1630دا بلاوکراوەتـــەوە ناوبـــانگی دەرکـــردووە. لـــەم کتێبـەدا هـەوڵی داوە ڕێبازەکـەی قـەدیس ئۆگسـتین دەربارەی لێبوردنی خودایی و قەدەر زیندووبکاتەوە،





بەپێی باوەڕی جانسینیوس لێبوردنی خودایی تەنها کەمێك بوونەوەر دەگرێتەوە لەوەتی لەدایکبوونیانەوە. هەروەها نکوڵی لە ئازادی ئیرادە دەکات و پێی وانیە کە سروشتی مرۆیی هەر خۆی توانای ئەوەی هەبێ کە کاری چاکە بکات. جانسینیزم لە لایەن کلێسای کاتۆلیکی ڕۆمانیەوە پرۆتیستۆ کراوەو بە بیدعەو کوفر دانراوە.

5-ئەبیکتیتۆس (Epiktetose) (سەدەی یەك): یەکێکە لە فەیلەسوفانی هەیوان (رواق)، سەرەتای ژیانی لە ڕۆما کۆیلە بوو. لە دوایدا سەردارەکەی ئازادی کردو لە نیکۆپۆلس خوێندنگایەکی بۆ فێرکردنی فەلسەفە دامەزراند. لە نووسینەکانیدا داوای دان بە خۆاد گرتن دەکات لە کاتی تەنگانەدا.

6-مۆنتانی (Montaigne) (1533-1592): نووسەرو بیرمەندێکی فەرەنسیە. لەنێو تێڕامان و خوێندنەوەدا ژیانی بەسەربردووە. هزرو تاقیکردنەوەکانی خۆی لە دوو کتێب دا تۆمار کردووە: (هەوڵ) کە تیایدا باس لە بێ توانایی مرۆڤ دەکات لە گەیشتن بە هەقیقەت و داد، (ڕۆژانە) کە تیایدا ڕێژەبوونی کاروبارەکانی مرۆڤایەتی





دەسەڵێنیٚ.7-ئـارنۆ (Arnauld) (1694-1612): لاهــوت و زانایـەکی ئـایینی فەرەنسـیە، هــەواداری جانسـینیزم بووە، برای دایکە (ئانجیلیك ئارنۆ)یە.

8-جان ڕاسین (1639-1699): شاعیرو شانۆنووسـێکی فەرەنسیە، پەروەردەی دێـری پـۆر ڕۆیاڵـە. گرنگـترین شـــانۆییەکانی ئەمانـــــەن: ئـــــەندرۆماك (1667)، بریتـانیکۆس (1669)، میــتریدات (1673) و ، هــەردوو شـانۆیی ئاسـتر (1689) و ئاتـالی (1691) کـە سـیمایەکی ئایینیان هەیە.

9-مـــــــــــــــــــازاران (Mazarin) (1602-1661): سیاســەتمەدارێکی فەرەنســیە، بــە هــۆی هــەوڵ و کۆششەکانی ڕیشیلیۆوە بووە کاردینال. سـاڵی 1648 لـە ڕێگـای ئیمزاکردنـی پەیماننامـەی ڤسـتڤالیاوە کۆتـایی بە جەنگی سی ساڵەی ئەوروپا هێنا.

10-پیلاجیـــۆس (Pelagius) (نزیکـــەی 360-430): ڕاهیبێکی بەریتانییە داهێنەری بیدعەیەکە بە نـاوی خۆیـەوە ناسـراوە کـە دەڵـێ: مـرۆڤ بـۆ ڕزگـاربوون پێویستی بە چاکەو بەخشندەیی خودا نیە.

11-ئۆلیڤـــەر کرۆموێـــڵ (Cromwell) (1599-1658): پەرلەمانتارێکی ئینگلیزییە. ڕابەرایـەتی جوڵانـەوەی بەرهەڵستی دەسەڵاتی پادشای کـردو لـە سـاڵی 1649دا





بەسەر شاچارلیسی یەکەمدا سەرکەوت و دای لە سێدارە. لە ساڵی 1653دا ئیرلەندەی سەرکوت کردو پەرلەمانی لابردو بە شێوازێکی دیکتاتۆریانە فەرمانڕەوایی وڵاتی کرد.





## سەرچاوەکان

**BIBLIOGRAPHIE**

**1-La bibliographie generale des oeuvres de Blaise pascal, par M. Alfred Mavie, arretee en 1927, comporte cinq volumes (Giraud- Badin).**

**2-Parmi les innombrables etudes consacrees a pascal et a son oeuvre, Signaions:**

**Boutroux, Pascal (Hachette, 1900).**

**3-L. Brunschvicg, Le Genie de Pascal (Hachette, 1925).**

**4-L. Brunschicg, Pascal (Rieder, 1932).**

**5-Victor Cousin, Etude sur pascak (1842-1844).**

**6-Augustin Gazier, Port-Royal au XVIIe Siecle (Hachette, 1909).**

**7-Giraud, La vie heroique de Blaise Pascal (Cres, 1923).**

**8-Hatzfeld, Pascal (Alcan, 1901).**

**9-E. Jovy, Etudes Pascaliennes (6 Vol., Vrin 1927-1928).**

**10-Lhermet, Pascal et la Bible (Vrin, 1931).**

**11-Nedelgovitch, La pensee philosophique Creatrice de Pascal (Alcan, 1925).**

**12-F. Rauh, La Philosophie de pascal (Annales de la Faculte des Lettres de Bordeaux. 1892).**

**13-Ravaisson, La Philosophie de pascal (Revue des Deux- Mondes, 1887).**

**14-Sainte- Beuve, Port- Royal, t. III.15/T. Strowski, Pascal et son temps (3 Vol., Plon, 1907-1909).**

**16-Sully- Prudhomme, La Vraie religion selon Pascal (Alcan, 1901).**





**ئەم کتێبە لەم سەرچاوەیەوە کراوەتە کوردی:**

**پاسکال**

**حیاتە- فلسفة- منتخبات**

**نووسینی: ئاندرێ کریسۆن**

**وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: نهاد رضا**

**زنجیرەی "زدنی علما" بڵاوکراوەکانی "عویدات"**

**بیروت- لبنان/ چاپی دووەم 1977**





زنجیرە کتێبی گیرفانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

| ناوی کتێب | نوسینی | وەرگێرانی |
|---|---|---|
| 1-ژن لە شیعرو ژیانی مندا | نزار قەبانی | جەمال غەمبار |
| 2-نیچە | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 3-سوڕی مانگانەی ژن | مارتن لۆدڤیك | ئەکرەم قەرەداغی |
| 4-دیکارت | پۆڵ ستراتێرن | ڕەئوف بێگەرد |
| 5-بیری ئاینی کۆن لە میزۆپۆتامیادا | د. تەقی دەباغ | یاسین عومەر |
| 6-ڕێبازەکانی ڕەخنەی ئەدەبی | دیاینی. دەچز. ئبرامز | عەتا قەرەداخی |
| 7-ئایین و کەسایەتی | ل. پاڵس | ئاوات ئەحمەد |
| 8-هەشت نامە | گۆنتەرگراس-کینزابۆرۆئۆ | شورش جوانرۆیی |
| 9-ئانارشیزم | د. مستەفا ڕەحیمی | ڕێباز مستەفا |
| 10-کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد | ئارچی ڕۆزفڵت | ئەکرەم قەرەداخی |
| 11-دەربارەی دیالێکتیکی ڕۆشنگەری | موراد فەرهاد پوور | بەختیار سەجادی |
| 12-پۆزش | ئەفلاتون | ئاوات ئەحمەد |
| 13-ئاوابوونی هزرە تۆباوییەکان لە ڕۆژئاوادا. | ئایزایا بەرلین | کامیل محەمەد |
| 14-هونەری نیگارکێشان.... | شمیدت دیجینەر | وەهبی ڕەسوڵ |
| 15-چامەی پەخشان | سۆزان بیرنار | سەلاح محەمەد |
| 16- ئایین، عەلمانییەت ، فێندەمێنتالیزم | محەمەد ئەرکۆن | شوان ئەحمەد |
| 17- سارتەر | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 18-چۆن دەبیت بەباشترین هاوڕێی خۆت | میلدرید نیومان بێرنارد بێرکۆتس | شێرزاد حەسەن |
| 19-کوردو زمانی کوردی | تۆفیق وەهبی | عەزیز گەردی |
| 20-ئەنتۆنین ئارتۆو شانۆی ... | جلال ستاری | پێشرەو حسێن |